چاپی سێیەم

بەرەو چارەسەرێکی گونجاو — ٢

# نەوەی نوێ

## لە نێوان فکری ئیسلامی و تیۆری عەلمانی دا

هەوڵێك بۆ دیاریکردنی بەشێك لە گرفتە فکریەکانمان

بە دیدێکی سەردەمیانە






دکتۆر إدریس کاریتانی

# نەوەی نوێ لە نێوان فکری ئیسلامی و تیۆری عەلمانی دا

## نووسینی: د.إدريس كريم كاريتانى



چاپی سێیەم ٢٠١٨ز - ١٤٤٠ك




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆچاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

کاریتانی، إدريس كريم

نەوەی نوێ لە نێوان فکری ئیسلامی و تیۆری عەلمانی دا، إدريس كريم كاريتانى(نووسەر)

٢٥٧ لاپەڕە،

١٧* ٢٤ سم

بابەت، گەنجان، هزری ئیسلامی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٥١٢) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە.

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

دیزاینی ناوەوە: زەردەشت کاوانی

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

دیزاینی بەرگ: عمر عثمان عمر

# نەوەی نوێ لەنێوان
# فکری ئیسلامی و تیۆری عەلمانی دا

هەوڵێك بو دیاری كردنی بەشێك لە
گرفتە فیكریەكانمان بەدیدێكی سەردەمیانە

نووسینی :
ئیدریس کریم کاریتانی

چاپی سێیەم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ﴾

سورەتی السبأ: ٤٦

واتە: (پێیان بڵێ: بەڕاستی من هەریەك ئامۆژگاری ئێوە دەكەم، كە بۆ خوا و لەبەرخوا، دوو قوڵی یان بەتەنهایی، هەڵوێستە بكەن و پاشان بیربكەنەوە (لەم قورئانە، لەم پێغەمبەرە، لەم بەرنامەیە).

## پێشکەشە

- بە ڕوحی پاکی باوکم، وە برای کۆچ کردووم مامۆستا سیف الدین کە بەبێ باوك گەورەی کردم.

- بە دایکی خۆشەویستم بەردەوام لەدوعای خیر بی بەشم ناکات.

- بە کارزانی برام.

- بە هاوسەری بەڕێزم کە لە ژیانیدا هاوکاری زۆری کردووم.

- بەمنداڵەکانم.

سوپاس بۆ ماموستا فاتیح ملا سلیمان و کاك عبدالحمید مجید و م عبدالله، کە ئەرکی تایپ و هەڵەچنیان گرتە ئەستۆ، هەروەها بۆ هەموو ئەو مامۆستا و برا بەڕێزانەی، کە هاوکاریان کردووم و یارمەتیان داوم لە نووسینی ئەم کتێبە ئەگەر بە یەك وشەش بێت.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله تعالى من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله تعالى فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾

آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾

النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾

الأحزاب

أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، وأحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

# نـــاوەڕۆك

# پێشەکی چاپی سێیەم

تا ناکۆکی میللەتان لەجیهانی عەولەمە بەرەو زیاتر بچێت ئەوەندە بوارە فکریەکانیش دەکەونە ململانی زیاتر، باڵ بەسەر بوارەکانی تر ڕادەکێشن، دەرئەنجامی هەر داگیر کاری و دەست بەسەر داگرتنیك خوسەپاندنیکی تری بوارە فکریەکان، جیهانی ئیسلامی دوای ئەوەی سیستەمی حوکم و دەسەلاتی لەدەست دا سنورو جوگرافیا و گەل و نەوەی نۆیی بوتە گوڕپانی ساغکردنەوەو سەپاندنی فکرە ناتەندروست و لارو لەویرەکانی دونیا، دەولەتە زلهیزو جیهانی روژئاوا لەپەنا داگیر کاری سەربازی و ئابوری بەردەوام هەولیان داوە فکری ئەوروپی بەسەر نەوەی نویدا بسەپینن، لە ریی دەزگاکانی راگەیاندن و سیاسەتی تەعلیمی و پەروەردەو فیرکردن زورترین کار لەسەر نەوەی نوی دەکەن، ئەو تویژە توشی سەرگەردانی بوە، نازانی روبەروی کام گرفت ببیتەوە، کام ریگا و بیروکەو بیردوزو تێور هەلبژیریٚ، چون واقیعەکە بخوینیتەوە، چاران بیری لەهەستانەوەی دین و گەل و میللەت دەکردەوە، ئیستا ئینتیمای دینی و نیشتیمانی لەدەست داوە تەنها خەریکی ئەوەیە چون خوی بپاریزی و نەخلیسکیٚ، هەریمی کوردستان یەکیکە لەم هەریمانەی هیچ مەنهەجیکی نیە بو پاراستنی نەوەی نوی لە شالاوە فکریەکان، چەندان شەپولی بەهیزی فکری روی لەنەوەی نوی کردوە، لەئیلحادو بروا نەبون بەسونەتی پیغەمبەرو بەناو قورئانی و رەوتی جنیو دان و خیانەت خستنە پال صحابەو جیاکردنەوەی دین لەژین، ئاسانکاریان زور بو دەکریت و پالپشتیان هەیە، لەبەرامبەر ئەمانەدا نەوەی نوی بەکومەلیك گرفت و گیشەی فکری و سیاسی و کومەلایەتی و دارایی و ....هتد دەورە دراوە، ئاراستە ئیسلامیەکە لەجیهانی ئیسلامی بەهەردوو بالەکەیەوە واتە بالی دەعوەو سیاسەت لەپاشەکشەدایە، یان بلێین توشی دوگما بون بوە، ئەم پەرتوکەی بەر

دەستت رۆیایەکی ورد و نەخشە ریگایەکی فراوان دەداتە نەوەی نوی، هەولی داوە ریرەوی خویندنەوەی واقیع دیاری بکات و بنەماکانی تیگەیشتن لەژیان و وەلامی پرسیاری فەلسەفی لەکی و بوچی و دەچیەوە کێ بداتەوە، تیشکیکی فراوانی داوەتە سەر تەواوی فکرە سەردەمیەکانی عەلمانیەت و تیورە کانی، لەگەل کەسایەتیە دیارەکانی ئەم تیورە عەلمانیانە، تاوەکو نەوەی نوی بەئاسانی لەم ریبازانە شارەزا بیت، دەست بەریبازی راست و دروستی ئیسلام بگریت و ئیسلام وەك سیستەمی ژیان بناسی، کاری بو بکات، بیکاتە بنەمای سەرەکی، لەبەر ئەم هوکارانە هەروەها برایانی نوسینگەی تەفسیر داوایان کرد بو چاری سێیەم چاپ بگریتەوە سوپاسیان دەکەم خودا پاداشتیان بداتەوە.

د. ادریس کاریتانی

- ٢٩ - ٨- ٢٠١٨، هەولێر.

# پێشەکی چاپی دووەم

لەسەرو بەندی قەیرانە زۆر و ئالۆزەکانی هەرێمی کوردستان بەتایبەتی ئەوانەی ڕوبەڕوی گەنجان و نەوەی نۆی دەبنەوە!!! نازانی لەکام خاڵ دەست پێ بکەی و پەنجە لەسەر کام برینی نەوەی نوی دابنێی، جێگەی داخە گەنجان و نەوەی نوی بەم ئاقارە دادەبردرین و رۆژ بەرۆژ گرفتەکانیان لەبڕی جارەسەر قوڵتر دەبێتەوە، وەنەبێ نەوەی نوێ خۆی بوبێتە گرفت و قەیران دروست بکات، بەڵکو لەهەموو دونیا کام وڵات ڕێژەی نەوەی نویێ زورە، بێ قەیرانەو لە بوارەکانی سیاسی و ئابوری و سەربازی و بازرگانی و پیشەسازی زور بەهیزە !؟. لەوڵاتی ئێمە چونگە نەوەی نوێ پشت گوی خراوە و لەهیچ جومگەیەکی ئەم ولاتە بەشداری پی ناکریت و لەماف و ئیمتیازاتەکان بێ بەشە، ئینتمای نیشتیمانی لاواز بوەو لەبەر گرفتی خوێ زۆر نا پرژێتە سەر خزمەت کردن و داهێنان و هەنگاو نان بەرەو لوتکە، ئێمەش ناتوانیین کەمێك لەئازارە ماددی و مەعنەویەکانی کەم بکەینەوە، تەنها ئەوە نەبێت لەرِیی قەڵەم کەمێك پارێزگاری لە شوناسەکەی بکەین، بەتایبەتی دوای چاپ کردنی نەوەی نۆی بەماوەیەکی زۆر کەم لەهەموو کوردستان بڵاو بۆوەو تا ڕادیەك بەپێی دەیان تەلەفون کەلەبارەی کتیبەکەوە بوم کرا، کە ئەم کتیبە کەلێنێکی گرفتی فکری بۆ گەنجان پرِکردۆتەوە زۆر خوشحالی کردم، جگە لە پەیوەندیەکی زۆری نەوەی نوی، ئەمانە پاڵنەری بەهێز بون بۆچاپکردنەوەی ئەم کتێبە بەتایبەتیش کە لەبازار نەمابوو، دوو براش کەبەپیویستی دەزانم ئاماژەی پێ بکەم ئەرکی خەرجیەکەیان کیشا. بەئومیدی بەرەو پێش بردن و هەنگاوێکی تری کاروانی فکرییمان انشاءالله.

ادریس کریم کاریتانی . هەولێر، ١٨/١/ ٢٠١٦.

# پەیـڤێك

سەردەمی ئێستا ناخۆشترین سەردەمە بەسەر ئومەتی ئیسلامی دا تێدەپەری، ڕاستە لەوەتەی خۆری ئیسلام هەڵهاتووە بەردەوام شەمشەمەکوێرەکان چاویان هەڵنەهاتووە و دژایەتیان کردووە، بەڵام لەدوای نەهامەتی و ئازارەکانی سەردەمی تەتەرو مەغۆلەکان هیچ چەرخێك بەئەندازەی ئەم چەرخە نەهامەتی و ناخۆشی بەسەر موسڵماناندا تێنەپەریووە، ناخۆشی و دەرد و مەینەتی ڕۆژبەڕۆژ و ساتبەسات ڕوو لەزیادبوونە، زۆرینەی زۆری ئەوەی دەکوژرێ، دەبڕدرێت، لەناودەچێت و بەنددەکرێت، لێی دەدرێت داگیردەکرێت، ماڵی دەخورێت، خاك و زەوی لێ زەوت دەکرێت، ناتوانین گوێ لە هیچ کەناڵێکی ڕاگەیاندن بگری (بیستراو، بینراو، نوسراو) پڕلە ژمارەی کوژراو و بریندار و نەهامەتی موسڵمانانە لە عێراق، سوریا، میسر، فەڵەستین، تونس، لیبیا، ئەفغانستان، میانمار، چیچان، بۆرما، ئەفریقیای ناوەراست، کۆسۆفۆ، بە کوردستانی خۆشەویستمانەوە، دونیا لە ئاست ئەم هەموو زوڵم و ستەم و نادادوەرییە بێ دەنگە، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ کەسێکی ناموسڵمان دونیا دەهەژی و زلهێزەکان دێنە دەنگ و هەرچی بەناو مافی مرۆڤ و ئازادی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان هاواریان لێ هەڵدەستێ، شاعیر تەواوی فەرمووە:

قتلُ امرءٍ في غابةٍ جريمةٌ لا تُغْتَفَرْ ... وقتلُ شعبٍ كاملٍ مسألةٌ فيها نَظَرْ

واتە: (کوشتنی کەسێك لە دارستانێك تاوانێکە و لێخۆش بوونی نییە .. وە کوشتنی گەلێك بەتەواوی باسێکە و تێبینی لەسەرە) بەم پێوەرە هەرزانترین خۆێن لە جیهان بۆتە خوێنی موسڵمانان.

سەرەڕای ئەم ناخۆشیانە بۆ ماوەی (٢٣) ساڵە بەفەرمی لە کوردستان ڕابوونی ئیسلامی کاردەکات لە ناو میللەتێکی موسڵمان بەڕێژەی (٪٩٥) بۆ گێڕانەوەی حوکمی خوا، میللەتی کورد بەم ڕێژەیە، دان بە موسڵمانبوونی خۆی دادەنێت و ئیسلامی وەك (تەدەیون) قبووڵە، واتە لەڕووی غەریزە و هەست و لایەنی هزرییەوە ئیسلامی قبووڵە، بەمانایەکی تر لەڕووی پەیوەندی خۆی بە خوداوە لە نوێژ و ڕۆژو زەکات و حەج و دروشمەکانی تر ئەنجامیان دەدات و هیچ گرفتێکی لەگەڵ نییە. چونکە تەدەیون وەك شتێکی سروشتیە لەناخی مرۆڤەکان و هەموو تاکێك هەیەتی، بۆیە مرۆڤەکان بەگشتی لەم ڕووەوە گرفتیان نییە.



تەنانەت ئیلحادیەکانیش شتێك هەردەپەرستن وەك مرۆڤ و فکرە و حزب و سەرکردە و کەسایەتیەك. بەئاشکرا دەبینین نوێژی بەکۆمەڵ و نوێژی هەینی و نوێژی تەراویح و زیکرکردن و بەخشین و یارمەتی هەژاران و قورئان خوێندن و تەواوی خواپەرستییەکانی تر، وەك نێوانی خۆی خودا ئەنجامی دەدات، بەڵام کاتێك دێتە سەر ئیسلام وەك ئایین واتە سیستەم و بیروباوەری ئیسلام وەك ژیان ڕێژەکە لە (٪٩٥) دادەبەزێت بۆ (٪١٥) و سیستەم و فکرەیەکی عەلمانی هەڵدەبژێرێت و قبووڵی ئیسلام ناکات، سیستەمی ژیان لێرەوە ئایین لە ژین جیادەکاتەوە. عەلمانیەت بەسەر ئیسلام دا هەڵدەبژێرێ، ئەمەیان هۆکارەکەی چییە؟ بۆچی ئیسلامیان وەك سیستەمی ژیان قبووڵ نییە؟ هۆکارە سەرەکییەکانی چین و بۆچی دەگەڕێتەوە؟ کێ بەرپرسیارە؟ مامۆستای ئاینی، شێخ، سەید، حزبی ئیسلامی، پەیڕەو و پرۆگرام، بانگخوازەکان، ڕاگەیاندن، سەرکردەکان، خەڵك و جەماوەر، زلهێز و وڵاتە دەرەکییەکان، پارە و سەروەت و سامان، پیلانی جوولەکە و نەصرانییەکان، ژینگە و پێکهاتەکان، لایەنی سایکۆلۆژی، فکر؟ یان ئیسلام بۆ ژیان نەهاتووە و بەکەڵك ئەم سەردەمە نایەت؟ ئەمانە هەمووی پرسیار گەلێکن وەڵامی تێروتەسەل و وردی دەوێت، بەدرێژایی ئەم (٢٣) ساڵە زۆر هەنگاو نراوە، زۆر بابەت وروژێنراوە، زۆر (ئەفکار) دروستبووە، زۆر ڕێگا گیراوەتەوە بەر، تا ئەم دەردە دیاری بکرێت و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام

ئەگەر دان بەهەق بنێین تائێستا لە دواوەین و نەگەیشتوینەتە چارەسەر، من بەهیچ شێوەیەك نالێم چارەسەر لای منە، بەڵام بەپێی ئەم دیراسە کەمەو زانستە کەمەی کە من هەمە (والله اعلم) پێم وایە بەشێك لەم گرفتە چارەسەر دەکەین ئەگەر ئێمە بێین جارێکی تر ئیسلام وەك خۆی لەڕێگەی فکری ئیسلامی دابڕێژینەوە، واتا ئیسلام لە ڕێگەی فکرەوە پێناسە بکەین، کە ئیسلام ژیان و ئابووری و سیاسەت و ئیدارە وفەلسەفەیە.

لە قۆناغی ئێستادا جیهانی ئیسلامی جارێکی تر توشی لادانێکی فکری زۆر بۆتەوە، بەشێوازێکی تر بەتایبەتی لەدوای سەرهەڵدانی علمانیەت لە جیهانی ئیسلامی، لەدوای ڕووخانی خیلافەت، ئێستا چین و توێژەکان بەتایبەتی گەنج و نەوەی نوێ زۆر بەدەست ئەم فکرەوە دەناڵێنێ.

ئاستی هۆشیاری فکری وسیاسی لای تاکی کورد زۆر بەرزو ڕوون نییە، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، عەلمانیەت و فکرەکەی چەندان بەرگی سەیر و پۆشاکی جیاوازیان لەبەر کردووە. زۆر بەئاسانی بەتایبەتی گەنجان و نەوەی نوێ ناتوانن خویندنەوەی تەواو ڕاستی بۆ بکەن، ناخۆشی و ئازار و دەربەدەری و ئەنفال و نەبوونی سەربەخۆیی ئەم گەلە بۆ فکری عەلمانی دەگەڕێتەوە. یەك سەدەیە عەلمانیەت هاتۆتە وڵاتی ئێمە، سەرجەم مەینەتیەکان دەستی پێکردووە و بۆتە ڕێگر لەبەردەم سەربەخۆی بوونمان، چوار پارچە ودابەش بوونی کوردستان بە پرۆژە و ڕێکەوتنی عەلمانیەت بووە، کە ئەویش پەیمانی (سایکس-بیکۆ)یە. تا ئیسلام دەسەڵاتدار بوو کورد زیاتر لە (٦٣) ویلایەتی هەبوو هەر ویلایەتێك دەسەڵاتەکەی لە فیدرالی ئێستا زۆر فراوانتر بوو، قەڵەمڕەوی ئەم سەردەمە گشتیان عەلمانین و باس لە مافی چارەی خۆنوسین و ئازادی و مافی مرۆڤ دەکەن، کەچی کەس میللەتی کورد بەڕەوا نابینێ خاوەنی قەوارەی خۆی بێ، بۆیە چارەسەری ئایین و ژینمان، خاك و وڵاتمان،سەربەخۆیی ئازادیمان، ڕاستکردنەوەی باوەڕ و فکرمانە .

# دەستپێك

لەوەتەی مروڤ هاتۆتە سەر ئەم زەوییە کەوتۆتە ململانێ، لەیەکەم هەنگاویدا ململانێ لە نێوان هابیل و قابیل سەری هەڵدا، ئەم ململانێیە درێژەی کێشا لە سەرەتاوە تا ئەمرۆ بەبێ پچڕان بەردەوامە، حەق و ناهەق دوو چەمکی مێژویین بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ لە سەرزەوی بەرامبەر یەکتر وەستاون و لە ململانێ دان:

﴿يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ﴾[1]

واتە: (هەردووکیان هەڵگرو پەیڕەوکارانیان زۆرن بەڵام هەڵگرانی ناهەقی زۆرترن)، بەردەوام حەق لەلایەن بەشێکی زۆرەوە بوغزێنراوە:

﴿بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾[2]

واتە: (بەڕاستی هەقیان بۆ هات بەڵام زۆربەیان ڕقیان لە هەقە و دژی دەوەستنەوە). مرۆڤ بەسروشت حەز بە سەرپێچی دەکات، پەلە دەکات بۆ کاری خراپ:

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ﴾[3].

پەلە دەکەن بو خراپە پیش چاکە. پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر) هەموویان هەڵگری هەق بوون بەبەردەوام ڕووبەڕووی ناهەقی بونەتەوە، بێ وچان، بەشەو و ڕۆژ، بەئاشکراو بەنهێنی، لەگەڵ خزم و بێگانە، هەقیان ڕاگەیاندووە.

---

(١) سورەتی طه ئایەتی (١١٧)

(٢) سورەتی المؤمنین ئایەتی (٧٠)

(٣) سورەتی الرعد ئایەتی (٦)

﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴾[١]، هەق گەیاندن کارێکی ئەستەمە و خەبات و هەوڵ و کۆششی شەو و ڕۆژی دەوێ. خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارًا وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمْ فِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْاْ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّواْ وَٱسْتَكْبَرُواْ ٱسْتِكْبَارًا ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ثُمَّ إِنِّيٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾[٢].

واتە: (دوای سەدەها ساڵ بانگەواز نوح سکاڵای کرد و وتی: پەروەدگارا من بەشەو و بەڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد (بۆ یەکخواناسی و پارێزکاری)، کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکردن: تەنها ڕاکردنیان نەبێت. بەڕاستی من هەموو جارێك کە بانگم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن، جلەکانیان بەسەر خۆیاندا دەدا تا نەمبینن، زۆر گەرم بوون لەسەر بێ باوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی و لووتبەرز بوون. پاشان من بە ئاشکرا بانگم کردن و (وتارم بۆدان). ئینجا من بەڕوونی و بێ پەردە هەموو شتێکم بۆ باسکردن، هەندێ جاریش بەنهێنی قسەم بۆ دەکردن (بۆ تاکە تاکە و خێزانەکانیان).

وەنەبێ هەڵگران و پەیڕەوانی ناهەقیش دانیشتبن و کاری بۆ نەکەن بەپێچەوانەوە ئەوان زۆر ماندووترن و ئازاری زۆر دەچێژن:

﴿ وَلَا تَهِنُواْ فِي ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِۖ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾[٣]

واتە: (لەبەرامبەر لەشکری بێ باوەڕانەوە کە شەڕتان پێدەفرۆشن یان بەربەستن لە ڕێگەی پێگەیاندنی بانگەوازی خوادا سستی و کەمتەر خەمی مەکەن و بکەونە دوایان، چونکە ئەگەر ئێوە ئێش و ئازار و ماندوویێتی و برینداریتان بۆ پێش بێت، بۆ ئەوانیش هەر پێش دێت، بەڵام ئەوەی ئێوە بەئومێد و بەتەمان لەلایەن خواوە دەستان بکەوێت لە بەهەشتدا ئەوان بە تەمای نین، خوا هەمیشە و

---

(١) سورەتی الكهف ئایەتی (٢٩)

(٢) سورەتی نوح ئایەتی (٥ - ٩)

(٣) سورەتی نساء ئایەتی (١٠٤)

بەردەوام زانا و دانایە). لەگەڵ ئەم ئێش و ئازارەش هەڵگرانی ناهەقی تائیستاش بەشە و ڕۆژ کار بۆ بڵاوکردنەوەی ناهەقی دەکەن جۆرەها پیلان دەگێرن، خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرمووێت:

﴿بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾[١]

واتە: (بەڵکو پیلان و نەخشەی شەو و ڕۆژ بوو).

ململانێی پێغەمبەران لەگەڵ ئەهلی ناهەق سەرەتا لەسەر بیروباوەڕ دەستی پێ کردووە. هەر کاتێك میللەتان لەڕووی بیروباوەڕەوە لایان دابێ خوای گەورە پێغەمبەرێکی ناردووە و جارێکی تر بیروباوەڕی لەنێو ئەم میللەتە بڵاوکردۆتەوە، بۆیە هەموویان بەم شێوازە لە بیروباوەڕەوە دەستیان بەبانگەوازی کردووە، وەك خوای گەورە لەبارەی ئەم پێغەمبەرانەوە دەفەرمووێت:

﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾[٢]

واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە (نوح) مان ڕەوانەکرد بۆسەر قەومەکەی، جا ئەویش پێی وتن: ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نییە، بەڕاستی من دەترسم لە ڕۆژێکی گەورەدا تووشی بەڵا و سزایەکی زۆر سەخت ببن).

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودًاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾[٣].

واتە: (بۆ قەومی (عاد)یش (هود)ی برایانمان نارد (هەروەکو نوح) وتی: ئەی گەل و هۆزم هەر خوا بپەرستن چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تریان نییە، ئایا ئەوە لە خوا ناترسن؟!).

---

(١) سورەتی سبأ ئایەتی (٣٣)

(٢) سورەتی الاعراف ئایەتی (٥٩)

(٣) سورەتی الاعراف ئایەتی (٦٥)

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ ﴾[1].

واتە: (بۆ سەر قەومی (پمود)یش (صالح)ی برایانمان نارد (ئەویش پێی وتن): ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی ترتان نییە ).

﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾[2]

واتە: (باسی ئیبراهیمیش بکە کە کاتی خۆی بە قەوم و هۆزی خۆی وت: تەنها خواپەرستن و هەر لەو بترسن، ئەو بیروباوەڕە چاك و پەسند و خێردارترە بۆتان، ئەگەر بزانن و تێبگەن).



﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾[3].

واتە: (بۆ هۆزی مەدیەنیش (شعیب)ی برایانمان نارد، ئەویش پێی وتن: ئەی قەوم و هۆز و گەلم تەنها خواپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نییە).

دوایی خوای گەورە بەگشتی باس لە گشت پێغەمبەران دەکات و دەفەرموویت:

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾[4]

واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورەپەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر).

---

(١) سورەتی الاعراف ئایەتی (٧٣)

(٢) سورەتی العنکبوت ئایەتی (١٦)

(٣) سورەتی الاعراف ئایەتی (٨٥)

(٤) سورەتی النحل ئایەتی (٣٦)

ئەم لادانی هزریە لەسەر دەمێکەوە بۆ سەر دەمێك جیاواز بووە. مرۆڤ بە سروشت و غەریزە لەناخی خۆیدا هەست بە دینداری (الشعور بالتدین) دەکات، بۆیە هەموو مرۆڤێك بەبێ جیاوازی غەریزەی تەدەیونی هەیە، وەك غەریزەی خواردن و خواردنەوە و ئارەزووی شەهوەتی هەیە، بۆیە مرۆڤ هەر دەبێ (لابد) شتێك بپەرستێ بۆ ئەوەی غەریزەی تەدەین تێربکات. (هنری برجسون) دەڵێت: ((لقد وجدت وتوجد جماعات انسانیة من غیر علوم وفنون وفلسفات، ولکنه لم توجد قط جماعة بغیر دیانة)) واتە: (بەڕاستی بینیومە و دەبینرێ گۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەبێ زانست و هونەر و فەلسەفە، بەڵام نەبینراوە بەهیچ شێوەیەك گۆمەڵگەیەك بەبێ ئایین)، دەڵێت ئەوانەی کە پێیان دەڵێن (ملحد) ئەوانیش شتێك هەر دەپەرستن ئینجا بیروکەیەك بێت، یان کەسێك، یان سەرکردەیەك، یان مادده و پارەو پول هتد...

بەدرێژایی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی جگە لە خوای تاقانە جۆرەها شت پەرستراوە، وەك بت و سەنەم و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە و هەور و بروسك و دار و بەرد و بوزا و گیانەوەر و تا کار دەگاتە مرۆڤ پەرستی. لە سەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی تر، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، لە میللەتێکەوە بۆ میللەتێکی تر لادانە هزری و بیروباوەرەکان زۆر جیاواز بوون، بەڵام بەگشتی لادان بووە لە بیروباوەر و فکری ڕاست و دروست، لە قۆناغی ئێستادا جارێکی تر جیهانی ئیسلامی توشی لادانی هزری و بیروباوەر بۆتەوە بەشێوازیکی تر، بەتایبەتی لە دوای سەرهەڵدانی عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامی لە دوای ڕووخانی خیلافەت، جیهانی ئیسلامی تەواو بەدەستی هزری عەلمانی دەناڵێنی. جیهانی ئیسلامی وەك تەدەیون، واتە: نێوانی خۆی و خوا تاڕادەیەك ئاوەدانە و ئەم غەریزەیە جێبەجێ دەکرێت، لە نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و تەراویح و قورئان خوێندن و سڵاو لەیەکتر کردن و جەژن کە ئەمانە بیروباوەڕن بەدڵنیاییەوە کاری گەورە و پیرۆزن، بەڵام لەڕووی ئایینەو واتە: ئیسلام وەك ژیان، سیستەم (نظام)، وەك بیروباوەڕ خەڵکێکی زۆر تێکەوتووە، کەسەکە لەڕووی تەدەیونەوە موسڵمانە و تەواوی خواپەرستییەکانی نێوان خۆی و خودا ئەنجام دەدات، بەڵام

هەڵەی تێکەوتووە. هەڵگری هزری عەلمانیە و ئیسلام وەك تەدەیون دەناسێ نەك وەك ئایین (نظام، عقیدة).

دیارە کوردستانی خۆشەویستی خۆشمان کە بەشێکە لە جیهانی ئیسلامی لەم لادانە هزریە بێ بەش نەبووە، دەبینین لەکاتی نوێژەکان و زەکات دان و تەراویحی ڕەمەزان (٪٩٥) موسڵمانە و ئینکاری ئیسلام ناکات. بەڵام کە کار دێتە سەر ئایین، واتە: ئیسلام سیستەمی ژیانی بێت ئەوە (٪١٥) دەمێنێتەوە و ئەوانی تر جارێکی تر عەلمانیەت وەك سیستەمی ژیان دەکاتە بەرنامەی خۆی، ئینجا ئەم گرفتە لە زۆر ڕووەوە کاری لەسەر کراوە، بەڵام تائێستاش بەرەو پێش چوونی یان ڕاستکردنەوەی ئەستەمە و چەق بەستووە و نەتوانراوە تاڕادەیەك چارەسەر بکرێت و بەتەواوی برینەکە لە لەلاشەی میللەتی کوردی موسڵمان چارەسەر بکرێت. بەندەش وەك هەر تاکێکی تر خۆم بە بەرپرسیار دەزانم بەرامبەر خودا و گەلەکەم، وام هەستکرد گرفتەکە بەشی هەرە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە هزری ڕاست و دروستی ئیسلام، بەپێویستم زانی لەم بارەیەوە ئەم کتێبە وەك چارەسەرێکی فریاکەوتن (الطواريء) بخەمە بەردەستی گەلەکەم بەئومێدی ئەوەی بەشێکی کەم لەم هەنگاوە چەق بەستووە بەرەو پێش ببەین و ئەم کاروانە بەئامانج بگەینین (إن شاءالله).

ئیدریس کاریتانی

٢٠١٥/٣/١ هەولێر

## هۆكاری نوسینی ئەم كتێبە

تاكی كۆمەڵگەی ئێمە بەكۆمەڵێك گرفت گیرۆدە بووە، بەتایبەتی لەدوای كردنەوەی جیهان بەڕووی عەولەمە، سەرپەرشتیارانی عەولەمە توانیان كەمتر لە نیو سەدە كلتور و فكر و ڕەوشت و بوارە كۆمەڵایەتیەكان تێكەڵ بكەن و شوناسی گەلان بخەنە مەترسیەوە، كوردستان و تاكی كوردیش بەتایبەتی گەنج لەم شەپۆلە ترسناكە بێ بەش نەبوو، خۆ ئەگەر تەماشای ڕاوو بوچون و سەروسیما و هەڵسوكەوت و ڕەفتاری هەندێك لەگەنجانمان بكەین زۆر ئەستەمە بتوانی لەگەڵ كەسێكی ئەوروپی لە ڕووی جلوبەرگ و هەڵسوكەوتەوە جیای بكەینەوە، شوناسی كەوتۆتە بەرمەترسی و پارێزراو نییە! سوڕێك بەنێو بازاڕ و دوكان و ماركێتەكان بكە، دەبینی ناوی ئینگلیز و ئەوروپی، زۆر بەسەر شار و بازاڕماندا زاڵە، هەمووی بۆتە ناوە بیانییەكان، ئەم نەوە تازە پێدەگات زۆر بەزەحمەت دەزانێ شوناسی خۆی پێناس بكات. ئایا ڕۆژهەڵاتییە یان ڕۆژئاواییی؟ موسڵمانە یان نا، كلتور و داب و نەریتی كۆمەڵایەتی هی خۆیەتی یان هاوردە؟ لەهەموو ئەوانەش ترسناكتر لایەنە فكرییەكەیە، ئایا ئێستا تاكی كوردی دەزانێ لە بڕیار و هەڵسوكەوت و وتوویژەكانی كار لەسەر كام فكر دەكات. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەتی كوردستان بۆ ماوەی نیو سەدەیە گەلاڵەی فكری ماركس و دواتر سۆسیالیست و سۆشییال دیموكرات و سەرمایەداری كردووە و كاریگەری و ئاسەواری ئەم قوتابخانە فكرییانە زۆر زۆر بووە لەسەر گەنجانی وڵات، خۆشەویستی لەناو دڵیان داچەقیووە و كاری بۆ دەكەن و بەشانازیەوە خەڵكی بۆ بانگ دەكەن، سەرەڕای پەیدابوونی دەیان ڕێكخراوی بەناو جیاواز لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بانگەشە بۆ فكری عەلمانی دەكەن، تا كار بكەنە سەر سیستەمی وڵات و دەستكاری پەیڕە و پرۆگرامی پەروەردە و فێركردن و دەزگاكانی ڕاگەیاندن بكەن. بۆ بەرگرتن لەم شەپۆلە ترسناكە بەپێویستمان زانی وەك هەنگاوێكی سەرەتا چەند چەمكێكی فكری سەردەمی شیبكەینەوە و تیشكی بخەینە سەر چۆنیەتی پاراستنی شوناسی تاكی كورد و گێرانەوەی بۆ فكری ئیسلامی ڕەسەن و هاوچەرخ.

## بۆچی بواری فکریمان هەڵبژارد؟

### هۆکاری هەڵبژاردنی فکر بۆ چەند خاڵێک دەگەڕێتەوە:

**یەکەم:**

لەم سەردەمەدا ململانێیە فکری و سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتوری و فەرهەنگی زۆر بەهێزن، لەهەموویان بەهێز و کاریگەرتر لایەنی فکریە، ڕاستە زلهێزەکانی دونیا دەیانەوێ لایەنەکانی تریش بەسەر بەرامبەریاندا زاڵ بکەن، بەڵام هیچیان بەئەندازەی بوارە فکرییەکان ترسناك نین.

**دووەم:**

ئەوەی هەست بە ئازار و ناخۆشییەکانی گەنجان بکات دەزانی پێویستە بە زووترین کات ئەم بابەتە بوروژێنێ و چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزینەوە، ڕۆژانە گەنجانمان لەخشتە دەبرێن. ئەگەر گەنج بە لاڕێ ببرێ، ئەوا هێز و توانای میللەت و وڵاتیش لەبن دێت. ئێستا گەنج نازانێ لەسەر کام فکرەیە و کار بۆ کێ دەکات و لە خزمەت کێ دایە و بۆ کێ دەژێت!

**سێیەم:**

بیردۆزە هاوردەکانی سەردەم لە دەروازەی فکرەوە گەنجان هەڵدەخەڵەتێنن! ناڵێن نوێژ و ڕۆژ مەگرە و پەیڕەوکردنی ئایین لەنێوان خۆت و خودا وازبینە، بەڵکو لەڕووی فکریەوە لاڕێت دەکەن و شوناس و فکری ئیسلامت لا ناشیرین دەکەن و جۆرەها ناوناتۆرەی بۆ دەدۆزنەوە.

**چوارەم:**

وتاری ئایینی وتاربێژ و بانگخوازان لەگەڵ ئەوەی یەکجار زۆرە، بەڵام بەشی هەرە زۆری تیشك خراوەتە سەر لایەنی ڕۆحی و ڕەوشت و (تەزکیەی نەفس)، وەك ئەوەی ئیسلام تەنها پەیوەندی نێوان خۆت و خودایە و بەس، ئەم جۆرە

وتارانە لایەنی فکری تاك بەهێز ناکات. لەلایەکی تر وەك ئەوە وایە کە ئیسلام سیاسەت و فکر و پەیڕەوی ژیان نییە، تەنها پەیوەندی نێوان ڕۆح و خودایە.

**پێنجەم:**

له جیهاندا ئەوانەی توانیانە گۆڕانکاری دروست بکەن و خاوەنی شۆڕش و چاکسازی بوون، زۆرترین کەسیان لە دەوری خۆیاندا کۆکردۆتەوە کەسانی فکری واتە بیرمەند (المفکر) بوون، دەبێ ئەمە ببێتە قوتابخانەیەك تاکی کۆمەڵگەی لەسەر پەروەردە بکرێت.

**شەشەم:**

کۆمەڵگە بەسەر سێ بەشی سەرەکی دابەش دەبێت بەڕێژە وەری بگرین، (٪٨٥)ی دەبێت سەروکار بکرێت و کەسانێك هەبن ڕێنیشاندەریان بن و سەر مەشقایەتیان بکەن، (٪١٠)ی تریش لەم نێوەندەدا واتە: نە سەرکردەن و نە لە ڕێژە زۆرەکەن، بەشی سێیەم لە (٪٥)ن بیرمەند و دانا و زانا و پێشەنگن. سەرکردە و پێشەنگیش بە هۆشیاری فکری دروست دەکرێت.

## گرنگی بابەتی بیروهزر (فکر)

خودای گەورە مرۆڤی لە دروستکراوەکانی تر جیاکردۆتەوە بە عەقڵ، توانای داوەتێ کە بەم عەقڵە بیربکاتەوە. سەیری قورئان بکە زۆر بە ڕوونی بۆت دەردەکەوێت کە فکر و بیرکردنەوە. چەندە گرنگە بۆ مرۆڤ، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ﴾[١]. واتە: (دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێ بکاتەوە).

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾[٢]. واتە: (کەواتە با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کەلە چی دروستکراوە).

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾[٣].

واتە: (ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە بە سەریانەوەیە: چۆنمان دروست کردووە و ڕازاندوومانەتەوە بەجۆرێك هیچ کەم و کوڕی و کەلێنێکی تێدا نیە).

﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ﴾[٤]

واتە: (ئینجا خوای دروستکار لە ڕوانگەی هەندێك دروستکراوانیەوە دەیەوێت بێباوەڕان دابچڵەکێنێت، بۆیە دەفەرموێت: ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن

---

(١) سورەتی عبس ئایەتی (٢٤)

(٢) سورەتی الطارق ئایەتی (٥)

(٣) سورەتی ق ئایەتی (٦)

(٤) سورەتی الغاشیه ئایەتی (١٧ - ١٨)

دروستکراوە، (قەبارەی، ملی درێژی، قاچە درێژەکانی کە بە سمێکی ئیسفنجی کۆتایی هاتووە، ئینجا خۆگرتنی لەسەر برسێتی و تینویەتی...).
(ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە، ئەو هەموو ئەستێرە و کاکەشان و هەسارە بێ شومارە دەورەی زەویداوە لە بڵندیەوە ڕاگیراون).

﴿ قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ﴾[١]

واتە: (ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: با بگەڕێن بەزەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە).

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾[٢]

واتە: (ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەم بەڵگە و فەرمانەتان بۆ ڕوون و ئاشکرا دەکات بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە و (واز لەو شتانە بێنن کە زیانیان زۆرترە لە سوودیان، چی بۆ هەردوو جیهانتان چاکە ئەوە بکەن).

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّىۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴾[٣]

واتە: (ئایا ئەوە لەناخی خۆیاندا بیرێکیان نەکردۆتەوە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون، لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی بێباوەڕن بە گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[٤]

واتە: (یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروستکردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و

---

(١) سورەتی العنکبوت ئایەتی (٢٠)

(٢) سورەتی البقرە ئایەتی (٢١٩)

(٣) سورەتی الروم ئایەتی (٨)

(٤) سورەتی الروم ئایەتی (٢١)

میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئالەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوەو تێدەفکرن).

﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1] واتە: (ئا بەوشێوەیە ئایەتەکانی خۆمان ڕووندەکەینەوە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە و تێفکرن).

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾[2]



واتە: (هەر ئەو زاتەشە کە زەوی پان و بەرین کردووە و (هەرچەندە لە شێوەی گۆدایە)، کەژو چیاو ڕووباری زۆری تێدا دابینکردووە، لە هەموو بەرو بوومێك جووتی فەرهەم هێناوە لە هەردوو جۆرە، شەوی وا لێکردووە کە ڕۆژ داپۆشێت، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك بیربکەنەوە).

﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[3]

واتە: ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.).

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ﴾[4]

واتە: (پێیان بڵێ: بەڕاستی من هەریەك ئامۆژگاری ئێوە دەکەم، کە بۆ خوا و

---

(١) سورەتی یونس ئایەتی (٢٤)

(٢) سورەتی الرعد ئایەتی (٣)

(٣) سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩١)

(٤) سورەتی سبأ ئایەتی (٤٦)

لەبەرخوا، دوو قۆڵی یان بەتەنهایی، هەڵوێستە بکەن و پاشان بیربکەنەوە (لەم قورئانە، لەم پێغەمبەرە، لەم بەرنامەیە).

لەم ئایەتانە بۆمان دەردەکەوێت کە فکر ڕەکیزی ئەساسی مرۆڤە و نیشانەی زیندوییی و پێشکەوتنیەتی، یەکخستنی فکر بۆ تاکەکان خاڵی بەهێزی یەکخستنەوەی کۆمەڵی موسڵمانانە، یەکبوونی (فکری) ئیسلامی لە دیارترین نیشانەکانی مێژووی ئیسلامیە لێرەدا بەخاڵ گرنکی (فکری) ئیسلامی و یەکخستن و بەهێزکردنی ئەم لایەنە دەخەینە ڕوو:

١- ئەم شارستانیەتە بەهێزەی ئێستای ڕۆژئاوا لەگشت بوارەکان ئەنجامی فکر و بیروهزری بێ وچانە.

٢- جیهانی ئیسلامی لەبەر نەبوونی کەرستەی خاو و داهاتوو مال و سامان دوانەکەوتوە، تەنها ڕێژەی بەرهەمی نەوتی (٦٢٪) جیهان پێکدێنێ، گرفتی تەنها بەکارنەخستنی بوارە فکریەکانە تا نەخشە و پلانی بۆ دارێژێ.

٣- ئەم سەردەمە سەردەمی دۆزینەوە و داهێنانە، مرۆڤ بەهۆی بیروهزرو ڕاهێنانی وای کردووە لە هیچ سەردەمێك نەیتوانیوە بگاتە ئەم پێشکەوتنە، ئێمە لەبەر لاسایی و دواکەوتەیی نەمان توانیوە نوێکاری لە داهێنان بکەین لە ڕێگەی فکرەوە .

٤- کاتێك ئومەت توشی نسکۆیەك دەبێت، یان ڕووداوێکی لەناوبەر ڕووی تێدەکات ئەوەی دەتوانی ڕاستی بکاتەوە توانا فکرییەکانە، ئەڵمانیا لەدوای هیتلەر بەتەواوی کاول بوو. تەنها تاکە خاوەن فکرەکان مابوون، توانیان جارێکیتر نەك تەنها ڕاستی بکەنەوە، بەڵکو ئێستا لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانە. یابانیش جوانترین نمونەی کردە هزرییەکانە دوای کارەساتی هێرۆشیما و ناکازاکی توانی لە پێشەنگی وڵاتانی شارستانی و زانستی سەردەم بێت[1].

ڕۆژئاواییەکان هەستیان بەوەکرد ناتوانن بەهێز هیچ شتێك لەگەڵ موسڵمانان بکەن بەتایبەت دوای شکانیان لەشەری خاچ پەرستی بەرامبەر بە سەلاحەددین

---

(١) (الفکر طبیعته واهمیته) أ.د. عبدالکریم بکار

ئەیوبی، بۆیە ڕوویان کردە بواری فکری و هەنگاویان ناو دەستیانکرد بە جەنگی فکری بۆ لێك هەڵتەکاندنی فکرەی ئیسلامی، چەکی ئەم جەنگەش (فێڵ، بیردۆز، بۆچوونی ناتەندروست، گومان، گۆڕینی چەمك و زاراوە هتد...) خوای گەورە خاوەنی ئەم جۆرە فکر و فێل و خراپەکارانە بەچەند ناوێك ناویان دەبات لە قورئان لەوانە (الشیطان، السفهاء، المعوقین، المرجفین، الغرور، الخبال، الفتن، هتد...). ئەم جۆرە کردارانە زۆر ترسناکترن لە کردەوەکانی تر، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ ﴾[1] واتە: (بێگومان هاوەڵگەری و زۆرکردن لە باوەڕداران تا پاشگەز ببنەوە لە ئاینەکەی لە کوشتن خراپترە).



کاتێك داگیرکاران جیهانی ئیسلامیان داگیرکرد زۆر گرنگیان بە دروستکردنی بۆشایی (فەراغی فکری)دا، توانیان ململانێی زۆر لەنێو ڕیزەکانی موسڵمانان دروست بکەن زۆر بە گرنگیەوە بوارە فکریەکانی وروژاند، (فکری قەومی و مادی و وجودی) و فکرە گومانیەکانیانی تریان بەناوی زانست و ئازادی و یەکسانی و مافی مرۆڤ بڵاو کردەوە. جگە لەوانەش لە ڕێی وروژاندنی پرسی ئافرەتان بەتایبەتی چەند کەسانێکی دیاری هەڵگری فکری عەلمانی وەك: (طه حسین، سلامة موسی، قاسم امین، احمد لطفي السید، صهرة اسماعیل). سەریان هەڵدا.

## چەند نمونەیەک:

١- (سەلامە موسا) لە کتێبی (الیوم والغد)، لەساڵی ١٩٢٦ دەڵێت: "میسر بەشێکە لە ئەوروپا نەك بەشێك بێت لە ئیسلام". هەروەها دەڵێت "ئەگەر نیەتمان لەگەڵ ئینگلیز پاك بوو ئەوا لەگەڵیان ڕێك دەکەوین و بەرژەوەندییەکانیان دەپارێزین، ئەوکات بەسەر کۆنەپەرستی زاڵ دەبین لە میسر، با ڕوو لە ئەوروپا بکەین"[2].

---

(١) سورەتی البقرة ئایەتی (١٩١)

(٢) سلامە موسی الیوم والغد (٢٣٩)

٢- (تەها حوسێن) لە کتێبی (مستقبل الثقافة فی مصر) لەساڵی ١٩٣٨ دەڵێت: "بەڕاستی ڕێگای سەرکەوتن و هەستانەوەمان ڕوونە و هیچ خواری و خێچی تێدا نییە ئەویش وەك ئەوروپییەکان بڕۆین بەڕێی ئەواندا هەنگاو بنێین، ببین بەهاوبەشی ئەوان لە شارستانیەت خێر و شەڕ و شیرینی و تاڵی و ئەوەی پێمان خۆشە و ئەوەی ناخۆشە"[١].

٣- (قاسم ئەمین) لە کتێبی (المرأة الجدیدة)، دوای ئەوەی قسە لەسەر کاروباری ئافرەتان دەکات لە میسر دەڵێت: "ئەمە ئەم نەخۆشیەیە کە دەبێ چارەسەری بکەین، هیچ چارەسەرێکی تر نییە تەنها ئەوە نەبێ منداڵەکانمان پەروەردە بکەین و شارەزا بن لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەسەرچاوە و لقەکانیەوە، ئەگەر ئەم ڕۆژە هات ئاواتەخوازین دوور نەبێ، ئەوسا حەقیقەت دەردەکەوێ لەبەر چاومان وەکو ڕۆژ نرخی ڕۆژئاوا دەزانین".

## لە کۆتایی ئەم قسانەدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت:

١- ژمارەیەك لە موسڵمانان بانگەشە بۆ ڕۆژئاوا دەکەن و فکری ڕۆژئاوا بڵاودەکەنەوە لە جیهانی ئیسلامی.

٢- بەستەڵەك بوونی فکری ئیسلامی.

٣- لاوازی لایەنی سیاسی.

٤- لە دەستدانی متمانە بەیەکتر.

٥- دەست گرتن بە پەروەردە و فێرکردنی ڕۆژئاوایی و پشتگوێ خستنی پەروەردەی ئیسلامی.

٦- لەکۆتایی دواکەوتن و پاشکۆیەتی ئیسلامی، هەڵە دەکرێ بە ملی ئیسلام دادێ. ئەمانە تەنها لە ڕووی فکریەوە، لەولاشەوە لەڕووی سیاسی و دەسەڵاتیشەوە (مستەفا کەمال ئەتاتورك) کەمتری نەکرد بە ئیسلام، کۆمەڵگایەکی تورکی

---

(١) مستقبل الثقافة فی مصر .

دامەزراند لە فکری عەلمانی . لە هندستانیش (ئەحمد خان) قوتابخانەیەکی فکری دانا بانگەشەی بۆ فکری ڕۆژئاوا و ماددەگەرایی دەکرد. قورئان و ئیسلامی تەفسیر کرد بەو شێوازەی کە شارستانیەتی سەدەی نۆزدەهەمی مەسیحی پێی گەیشتبوو.

ئەوە لەبیر نەکەین لایەنێکی ترمان هەیە کار لەسەر گونجاندنی ئیسلام دەکات لەگەڵ ڕۆژئاوا بەبێ گەڕانەوە بۆ قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).



## ئەم لایەنەش ترسناکییەکەی لە دوو لاوە هەستی پێ دەکرێت:

**یەکەم:** ئیسلام دەشێوێنێ و لەکەداری دەکات .

**دووەم:** ئەم بەناو پێشکەوتن و گونجاندنە سەرئەنجامی دووبەرەکی و پارچە پارچە بوونی موسڵمانانی لێ دەکەوێتەوە، کە ئێستای لێ بەرهەم هاتووە، هەر هەنگاوێك دەهاوێژرێ یەکریزی و یەکخستنی موسڵمانان کۆنابێتەوە ڕۆژبەرۆژ زیاتر لێکترازان زیاد دەبێت[١].

لێرەدا دەبێت جیاوازی لەنێوان شارستانیەت و ڕۆشنبیری بکەین لە ڕۆژئاوا. ئایین و ڕەوشت و هەڵسوکەوت تەنها لە قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەردەگیرێت، وەك بیروباوەڕ (عەقیدە) و پەرستشەکان (عبادەت) و سیستەمی ژیان، بەڵام پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ و سەرجەم کاڵاکان پەیوەندییان بە کڕین و فرۆشتن هەیە، هیچ گرفتێك نییە و سودی لێ وەردەگیرێ.

لە درێژەی ئەم بابەتە بۆمان دەردەکەوێت بیر و هزر و فکر لەم قۆناغەدا چەند گرنگە.

---

(١) مفهوم الفكر واهميتة، جميل عبدالله المصري

# دەروازەی فکری ئیسلامی

لەگەڵ بەهێزبوونی ململانێی ئایدۆلۆژیا، کۆمەڵێك چەمك لەم سەردەمەدا پەیدابوون لەوانە، فکری ئیسلامی لەبەرامبەر فکرەکانی تر، هاتنی فکری هاوردە گرفتێکی زۆری بۆ بەشێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە دروستکردوە، پرسیار گەلێك وەڵامی ئەستەمە، بەتایبەتی بوارە فەلسەفییەکان. زانایانی شارەزا لە فەلسەفەی ئیسلامی پێیان وایە تەنها گرنگیدان بە فکری ئیسلامی دەتوانێ لەم سەردەمەدا ڕووبەڕووی فکری هاوردە ببێتەوە و وەڵامی پرسیارە فەلسەفیەکانیش بداتەوە، پرسیار گەلێك لەسەر (ئیمان) و (مەبدەئی) و بوارەکانی تری ئیسلامی لە ڕێی فکری هاوردە دروستکراوە، پێویستمان بەوەڵامدانەوەیەکی بەردەوام هەیە، بۆیە فکری ئیسلامی بیری بەردەوامی بێ ڕاوەستانە، ناوەستێ لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە و کات و شوێنێکی دیاریکراو، یان بەرامبەر کەسانێك لە توێژێکی دیاریکراو. فکری ئیسلامی لەپێشدا توانی ڕووبەڕووی فکری ئیغریقی و فارسی و هندی هتد...، بێتەوە ئەمڕۆش دەتوانێ ڕووبەڕووی فکری عەلمانی و سەلیبی و مارکسی و لیبڕالی و سەرمایەداری و ئیشتراکی ببێتەوە. هەروەها توانی زاڵ بێ بەسەر گرفتە مەزهەبیە ناوخۆییەکانیش لە پێشدا، دەبێ لە ئێستاشدا زاڵ ببێت بەسەر ئەم گرفتە کوشندە ناوخۆییانەی کە هەیە لەنێو موسڵمانان، بۆیە فکری ئیسلامی سەردەم و قۆناغی هەیە، لەهەر سەردەم و قۆناغێك پیاوی خۆی هەیە و خاوەنی کەسی خۆیەتی: هەر سەردەم و قۆناغێك لەگەڵ سەردەم و قۆناغەکانی پێشوتر جیاوازیان هەیە.

لەم کتێبەدا تاك دەتوانی لە فکری ئیسلامی وردببێتەوە و ژیرانە بیربکاتەوە لە ڕۆژگاری ئێستادا خوێندنەوەی دروستی هەبێ بۆ فکرە هاوردەکان، فکری

ئیسلامی بەتەواوی لا جێگیربێ و سەرسام نەبێ بە فکری هاوردەی سەردەم، وەڵامی پێویست و زانستیانەمان بۆ پرسیارە فەلسەفیەکان بدۆزینەوە.

## پێناسەی فکری ئیسلامی

وتمان: بەکارهێنانی چەمکی فکری ئیسلامی تارادەیەك تازەیە بۆیە پێناسەیەکی دیاریکراوو تایبەتی نییە، بۆ پێناسەی وردی ئەم چەمکە پێویستمان بە پێناسەی وشەی فکرە.

## پێناسەی فکر لە ڕوی زمانەوانی:

لە (لسان العرب)دا (فکر) (أعمال الخاطر في شيء) لێکدراوەتەوە. واتە: کردەیەکی خەیاڵییە لە شتێکەوە[١].

لە (مقایس اللغة)دا (فکر) (تردد القلب في شيء) لێکدراوەتەوە. واتە: دوو دڵ بوون و ڕامان لە شتێك[٢].

دیارە لە لە قورئاندا گرنگییەکی تایبەت بە فکر دراوەو لە (**٢٠**) شوێندا فکر هاتووە بەڵام بە شێوەی خەسڵەتی (صیفە)ی کار (الفعل) هاتووە بە سیفەی ناو و چاوگ نەهاتووە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾[٣]، واتە: (بە ڕاستی ئەو بیری کردەوە و پەیامەکەی هەڵسەنگاند (بەڵام بە هەڵە).

-----------------------------------

(١) لسان العرب (ب ٥- ل ٦٥)

(٢) مقاییس اللغة لابن فارس (ب ٤ - ل ٤٤٦)

(٣) سورەتی المدثر ئایەتی (١٨)

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴾[١]

واتە: (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئایا کوێر و چاوساغ وەك یەکن؟ (لە راستیدا بێباوەڕ وەك کوێر وایە کە لە تاریکاییدا گیری خواردبێت و لەهەموو تاوێکی ژیانیدا و لەهەموو هەنگاوێکیدا بەتەمای کۆسپ و تەگەرەیە، لەولاشەوە ئیماندار بیینایە، چاوساغە، هەموو شتێکی لا ڕوونە، دەزانێت بۆ چی هاتووە، بۆچی دەژی، بەرەو کوێ دەچێت) ئایا بۆ بیرناکەنەوە و تێنافکرن لەو ڕاستیانە).

هەروەها دەفەرمووێت:

﴿ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[٢]، واتە: ( کەوابوو ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی (دایچڵەکێن و) بیر بکەنەوە.

## پێناسەی فکر لە ڕووی زاراوە:

لە (مفردات الفاظ القران) دا دەڵێت (الفكر قوة مطرقة للعلم الى معلوم وجولان تلك القوة بحسب نظر العقل، وذلك للانسان دون الحيوان، ولا يمكن ان يقال إلا فيها يمكن أن يحصل له صورة في القلب).

واتە: (هێزێکی لێدەری زانستیە بۆ زانراوێك، لەگەڵ خۆهێنانی ئەم هێزەش بە گوێرەی تێروانینی عەقڵە، تایبەتە بە مرۆڤ نەك گیاندار، ناگونجێ بگوترێ تەنیا کاتێك دەبێت کە وێنەیەك لە دڵدا جێ گیربوبێت[٣].

---

(١) سورەتی الأنعام ئایەتی (٥٠)

(٢) سورەتی الأعراف ئایەتی (١٧٦)

(٣) (راغب الاصفهاني)

بیرمەندانی هاوچەرخ بەم شێوەیە پێناسە یان کردووە:

**(دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی) دەڵێت:** (الفكر إسم لعملية تردد القوى العاقلة المفكرة في الانسان، سواء أكان قلبا أو روحا أو ذهنا بالنظر والتدبر، لطلب المعاني المجهولة من الأمور المعلومة، أو الوصول إلى الأحكام أو النسب بين الأشياء ).

واتە: ناوێکە بۆ کردەیەکی ڕامانی بەهێزی عەقڵی و یادەوەری و بیرنامەیە لە مرۆڤدا، ئینجا ئەم جوڵەیە جوڵەی دڵ بێ، یان ڕۆح یان مێشك، ئەمەش بە وردبوونەوە و تێڕامان بۆ بەدەست هێنانی واتای نادیار لە شتە زانراوەکان، یان گەیشتن بۆ زانینی ئەحکامێك، یان دیاری کردنی ڕەچەڵەکی شتەکان[١].

پێناسەی فکری ئیسلامی وەك یەك چەمك:

چۆن پێناسەی فکر لە زاراوە و چەمك و بەکارهێناندا جیابوو، چەندین پێناسەی هەبوو بەهەمان شێوە پێناسەی فکری ئیسلامیش چەندین پێناسەی هەیە. بەشێکیان باس دەکەین.

**١- (دکتۆر موحسین عەبدولحەمید) دەڵێت:** (الفكر الإسلامي يعني: كل ما أنتجه فكر المسلمين منذ مبعث الرسول (صلى الله عليه وسلم) إلى اليوم في المعارف الكونية المتصلة بالله - سبحانه وتعالى - والعالم والإنسان، والذي يعبر عن اجتهادات العقل الإنساني لتفسير تلك المعارف العامة في إطار المبادئ الإسلامية، عقيدة وشريعة وسلوك)[٢].

واتە: (هەموو بەرهەمە وەدەست هاتووەکانی فکری موسلمانانە لە کاتی هاتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا ئەمرۆ، لەو زانیاریانەی بونەوەر کە

---

(١) (الازمة الفكرية)

(٢) (تجديد الفكر الاسلامي)

پەیوەندییان بە خوای گەورە و زانست و مرۆڤەوە هەیە هەروەها ئەوانەش دەکرێتەوە، کە مرۆڤ تێدا (ئیجتیهاد) دەکات بەعەقڵ بوو تەفسیرکردنی زانیاریە گشتیەکان لە بازنەی (مەبادئە) ئیسلامیەکان، لە بوارەکانی (عەقیدە و شەرع و سلوك).

(فقه و زانستی قرآن و زانستی حدیث و تەفسیر و عەقیدە) و تەواوی زانستەکانی تریش بە فکری ئیسلامی دەژمێردرێت.



**٢- (مستەفا حلمی) دەڵێت:** الفكر الإسلامي يعني: (نتاج الفكر الذي تصدى للفلسفات والنظريات الغربية، ناقدا لها وواضعا البديل الإسلامي محلها).

واتە: (ئەم بەرهەمی فکریەیە، کە بەرهەڵستی فەلسەفە و تیۆرەکانی ڕۆژئاوا دەکات و ڕەخنەیان لێ دەگرێت و جێگرەوەی ئیسلامی لە شوێنەکانیان دادەنێن[١]).

**٣- (موحەممەد حوسێن عەبدوڵڵا) دەڵێت:** الفكر الإسلامي يعني: (الحكم على الواقع من وجهة نظر الإسلام)[٢].

واتە: (بڕیار و حوکم دانە لەسەر ڕووداوەکانی سەردەم بە پێی تێڕوانینی ئیسلام).

ئەمانە چەند پێناسەیەك بوون هەڵمانبژارد، بەتیڕوانین لەم پێناسانە چەند تێبینیەکمان بۆ دەردەکەوێت. لەوانە:

١- مەبەست لە فکر دەکرێ بڵێین: ئەو پەی پێبردنەیە کە مرۆڤ لە ڕێی بەکارهێنانی عەقڵەوە بەدەستی دێنێ، ئەو کات کەواتە فکر وەك (ئالەت و ئەداتێك) بەکاردێت بۆ پرۆسەی بیرکردنەوە.

٢- یان ئەوەتا فکر بەرهەمی ئەو پێشهات و تیڕوانینیانەیە بۆ بابەتە پێشنیارکراوەکان دەکرێت، دوای بازنەی بیرکردنەوەکە فراوان دەبێت، یان بەر تەسك دەبێتەوە، بەگوێرەی پێناسەکانی فکری ئیسلامی، ئەگەر پێناسەکە

---

(١) (الفكر الاسلامي في مواجهه الغز و الثقافي)

(٢) (دراسات فيى الفكر الاسلامي)

بەرتەسك بکرێتەوە ئەوا بازنەی بیرکردنەوەکەش بەرتەسك دەبێتەوە و گۆشەگیر دەکرێت تەنها لە تیڕوانینی عەقڵی ئەوکات فکر دەدرێتە پاڵ مەزهەبێك، یان تائیفەیەك یان سەردەم و یان بازنەیەکی تایبەت.

٣- لەکاتێك کە فکر دەدرێتە پاڵ وشەی ئیسلامی ئەوکات یان مەبەست پێ بیرکردنەوەی عەقڵی مرۆڤە لە ژێر ڕۆشنایی ئیسلام، بۆیە هەندێك لە بیرمەندانی ئیسلامی پێناسەیان کردووە، دەڵێن: ئەم پرۆگرام و بەرنامەیە کە موسڵمانان بیری لێ دەکەنەوە، یان پێویست دەکات بۆ داهاتوو بەرنامەی بۆ داڕێژن[1].



٤- بەم پێوەرە کردەیەکی هزریە بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان لە نادیار و نەزانراوی بۆ زانست و زانیاری، زانا پێشینەکانیش ئەم واتایەیان بەکارهێناوە، وەك (ئیبن سینا) و (ڕازی) و (ئیبن خەلدون) (جرجانی) کۆیان کردۆتەوە لە پێناسەیەك دەڵێن: (الفكر ترتيب أمور معلومة لتؤدي إلى مجهول)، واتە: فکر ڕێکخستنی کاروبارە زانراوەکان بۆ سەرکێشانی پەنهانەکان یان نادیار) ئەم پێناسەیە فکر و مەنهەج بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

٥- یان ئەوەتا مەبەست پاڵ دانە فکر بۆ لای ئیسلامی: ئەو بیر و هزرەیە، کە موسڵمانان لە ژێر ڕۆشنایی ئیسلام بەرهەمیان هێناوە، دوای ئەو دەرهاویشتە و ئامانجەکانی جیاواز دەبن بەپێی دیاریکردنی پێناسەکەی، هەندێکیان کە دەڵێن فکری ئیسلامی مەبەستیان بەرهەمی بیرو هزری زانایانی ئومەتی ئیسلامی و لێکۆڵینەوەکانیان بە پێوەر و بنەماو مەرجەکانیەوە، ئەمەش ناچێتە بازنەی بێ هەڵەبوون (العصمة)، هەروەها (وەحی)یش داخڵی فکری ئیسلامی نابێت، واتە: (کتاب و سوننە). بەم پێیە ئەوانە جیاوازی دەکەن لە نێوان ئیسلام و فکری ئیسلامی، خۆشیان دەپارێزن لە تێکەل کردنیان.

**تێبینی:** ئەم جۆرە پێناسەیە ڕەخنەی لێگیراوە، چونکە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکانیش ئەم جۆرە پێناسەیان هەیە بەم فراوانیە بە مەرج و بنەمای شەرعی، چونکە فکری

---

(١) دور حرية الراي في الوحدة الفكرية بين المسلمين، عبدالمجيد المختار (ل ٢٩)

ئیسلامی لەسەر ئیسلام هەژمارناکرێ ناکرێت، تەنها دەبێت (موافق) بێت لەگەڵ قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). کەواتە بەم پێیە فکری ئیسلامی کە کردەی بیرو هزر و فکری تاکی زانا و بیرمەندی ئیسلامیە، ئەگەر هەڵێنجراوی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، هەروەها تێك نەدەگیرا لەگەڵ ئەخلاقیات و سلوك و بنەما سەرەکیەکانی ئیسلام، ئینجا شارستانیەت بێ، یان فەرهەنگ و کلتور، یان زانستە سەردەمیەکان بێت، مادام بیر و هزری موسڵمانان دایان هێناوە و لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەوا ڕاست و دروست و تەندروستە.



## لە کۆتایی پێناسەکان :

فکری ئیسلامی لەم سەردەمەدا دەکرێ جگە لەم پێناسانە پێناسەی تریشی بۆ بکرێ، چونکە ئێستا لە جیهانی ئیسلامی لەبەرامبەر فکری ئیسلامی فکری عەلمانی بەهەموو جۆرەکانیەوە وەك لیبرالی و سەرمایەداری و ئیشتراکی هتد...، مومارەسە دەکرێت.

کاتێك ناسنامەی تاکێکی عەلمانی دیاری دەکەی دەڵێ: هەڵگری فکری سەرمایەداریە، یان لیبرالیە، یان ئیشتراکیە یان سۆشیال دیموکراتە، ڕاستە فکری ئیسلامی وەك لەپێشدا پێناسەمان کرد بەروبووم و بەرهەمی بیروهزری موسڵمانانە، بەڵام ئێستا بەڕای من دەکرێ بڵێین فکری ئیسلامی پێناسەی دووەمیش هەڵدەگرێ ئەویش (شوناسی ئەو کەسەیە کە هەڵگری بنەما و بیر و بەرنامە و ڕەوشت و و سلوکی ئیسلامە و بڕوای پێیەتی و کاری پێدەکات و بانگەشەی بۆ دەکات).

# سەرچاوەکانی فکری ئیسلامی



بەشێك لە لێکۆلەرەوانی سەردەم واگومان دەبەن، کە شارستانیەتی ئیسلامی لەنێو شارستانیەتی ڕۆژئاوا تواوەتەوە، بیروهزر و فکری ڕۆژئاوا هەموو کەرتە زانیارییەکانی لە ئیسلام داگیرکردووە، کۆی ئەم گومانە (ڕەفزە). چونکە فکری ئیسلامی سەرچاوە دەگرێت لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی خۆی، هەر لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ژیان و شارستانیەت و فکری ئیسلامی بکرێت، بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی با ڕەواج بە ئایدۆلۆژیا و بیرۆکەیەکی تریش بدات بەناوی زانستی و مەنهەجەوە ئەوا لەسەر فکر و فەرهەنگی ئیسلامی هەژمارناکرێت. دیارە هەموو ئایدۆلۆژیایەکی سەردەم لە بیروهزر و فکریاندا پشت بە زادە و بیری داهێنراوی مرۆڤەکان دەبەستن، فکری ئیسلامی وەك سەرجەم بەشەکانی تر لە ئیسلامدا ڕاستەوخۆ پشتی بە سەرچاوەی تایبەت و دیاریکراو دەبەستێت تایبەتمەندی جیاوازی هەیە لە بیروهزر و داهێنانیدا لەوانە:

## یەکەم: وەحی

مەبەست لە وەحی قورئانە ئەو قورئانەی کە:

﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴾[١]

واتە: (هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە، کە خاوەنی حیکمەت و دانایيە و

-------------------------------

(١) سورەتی فصلت ئایەتی (٤٢)

شایانی سوپاس و ستایشە.) ئەو قورئانەی، کە دەستوری ئوممەی ئیسلامیە، هەر فکرەیەکی ئیسلامی قورئان وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی تەماشا نەکات و پەیڕەوی نەکات ئەوا ئەم فکرەیە لە ئیسلام نییە، هەروەها سونەتی ڕاستی پێغەمبەرمان (صلى الله علیه وسلم) کە سەرچاوەی دووەمی پێك هاتووە لە گوفتار و کردار و ژیانی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم). ئەم دوو سەرچاوەیە نمونەی جێبەجێکردنی وەحی خودان، پەیوەندی لەنێوان قورئان و سونەت پەیوەندی تیۆری و کردەنی (پراکتیکی)، قورئان لەلایەنی تیۆری و سونەتی پێغەمبەرمان لەلایەن جێبەجێکردنەوە واتە: پراکتیك، وەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[١].

واتە: (ئێمە ئەوانمان ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو (موعجیزە) ی زۆرو کتێبی ئاسمانیداو ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بیرێك بکەنەوەو تێفکرن.)

کەواتە: وەحی بیر و هزر و فکر و دیدی موسڵمان بەتەواوی دیاری دەکات، سەرچاوەی فکری موسڵمان بە ڕەهەندی پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و کلتوری و ئابوری هتد...، سەرجەم بەشەکانی تر هەڵقوڵاوی ژێر ڕۆشنایی وەحی خوداییین[٢].

---

(١) سورەتی النحل ئایەتی (٤٤)

(٢) الفكر الاسلامی المعاصر، دراسة فی التدافع الحضاری د. محمد خروبات (ل ٢٨)

## دووەم: بونەوەر یان گەردوون (الكون)

بونەوەر یان گەردوون دووەم سەرچاوەی بیرو هزر و فکری ئیسلامییە. بە تێڕوانین لە گەردوون دیدی فکری ئیسلامی ڕۆشن دەبێت بەرامبەر بە مرۆڤ و ژیان، قورئان زۆر تەرکیز لەسەر جولانی بیرو هزرو فکر دەکات بەرامبەر بە گەردوون، ئەم ئایەتانەی تەرکیز لەسەر بیرکردنەوەو هزر دەکەن بەرامبەر بە گەردوون زۆر زیاترن لە ئایەتی (ئەحکام)، بەتێڕوانین و بیرکردنەوە لە یاسا گەردونیە سروشتیەکان لە ئاسمان و زەوی و دارودرەخت وگژوگیاو چیاو ڕووبارو گیاندار هتد...، جێنشینی مرۆڤەکانی بەرجەستە دەبێت. ئەمەیان پێی دەڵێن: (سونەتی گەردوون) (سنن الآفاق).

هەروەها بەتێڕوانین و بیرکردنەوە لە یاسا مرۆڤیاتیە سروشتیەکانەوە، بەلێکۆڵینەوە لە یاسا کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکانەوە لەگەڵ سونەتی شارستانیەت و ژیان و پسپۆڕی مرۆڤەکان شارەزاییان لە مێژوو کۆمەڵایەتی و دەروونناسی و بەشەکانی تر، کە پەیوەندییان بەمرۆڤەوە هەیە سونەتی مرۆڤەکان بەرجەستە دەبێت، (سنن الانفس) خودای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾[١]

واتە: (ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەرداو لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە کە لەسەردەمی زانستیدا چەندە نهێنیەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە. زاناکان بە گشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئاڵۆزی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن، کە ئەو زاتە حەق و

---

(١) سورەتی فصلت ئایەتی (٥٣).

ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە، کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!)

لێرەدا پێویست دەکات ئاماژە بەوە بکەین جیهانی مرۆڤ بەسەرچاوەیەکی گرنگی فکری ئیسلامی دادەنرێت بۆ زانیاری لەبارەی سونەتە دەروونییەکان (سنن الانفس)، بەڵام ئەوەی لە ئەنجامی پسپۆری مرۆڤەکانەوە بەرهەم دێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی مەزهەب و میللەت، وا هەژماردەکرێت، کە پردێکە لە پردەکانی فکری ئیسلامی وەردەگیرێ، یان ڕەت دەکرێتەوە[١].



## سێیەم: بەرهەمە نووسراوەکان

مەبەست لەم بەرهەمە نوسراوانەیە، کە بە درێژایی مێژوو زانایانی ئیسلامی نوسیویانە لە زانستی شەرعی سەرجەم زانست و هونەرەکانی تر، زانایان لە پێشدا لەگەڵ ئەوە نەکەوتنە ململانێ لەگەڵ ژیانی ڕۆژئاوا، بەڵام لەئەنجامی ئەم فکرانەی بەتایبەت دوای وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی کەوتنەخۆ بۆ ڕەتکردنەوە و نوسین و بەرهەمی زۆر بەهێز لەبواری (فکری و زانستی کەلام و فقە و ئوصول) جگە لە (تەفسیر) زانستی (تەصوف و زانستی حەدیث و دەرمانسازی و پزیشکی) و دەروونناسی و تەواوی زانستەکانی تر، ئەمانەش زادە و بەرهەمی موسڵمانانن کەلەپورێکی گەورەی فکری ئیسلامیە و لێکۆڵەری ئیسلامی بێ پێویستی نییە لەم هەموو سامانە زانستیە.

-------------------------------

(١) مدخل الى الفكر الاسلامي، مقالة .

## چوارەم: ڕووداوەکانی سەردەم یان (الواقع)

مەبەست پێی ئەم پێشکەوتنە سەردەمی و ژیاری و شارستانیانەیە کە کۆمەڵگەکان بەگشتی پێیدا تێپەڕیون و گەشە دەکەن، ئەمانە وەك سەرچاوەیەکی فکری ئیسلامی سودی لێوەردەگیرێ، بەڵام لەچوارچێوەی بنەماومەرجە شەرعیەکاندا. ڕووداوە سەردەمییەکان دەرهاوێشتەو کارلێکی فکری و هزریان دەبێت، کە چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین و هەنگاوی لەگەڵ بنێین، بەپێوەر و بنەما ئیسلامیەکان هەڵیانسەنگێنین، ئەمەش پێچەوانەی بنەمای مارکسیەتە لەوەی کە بوونی مادده هۆشیاری فکری دیاری دەکات، (واقعي) کۆمەڵگە مادده بڕیاری لەسەر دەدات و ڕێڕەوی داهاتوو دیاری دەکات، چ بکرێت و چی نەکرێ! ئیسلام ڕوونی کردۆتەوە کە بەشێکی زۆر لەم گرفتانەی هەن دەسەڵاتی بوونیان نییە، وەنەبێ لەبەر ئەوەی کە هەیە دەبێ ببێ، وەك بیرمەندی ئیسلامی (موحەممەد قوتب) دەفەرمووێت:

(ان مجرد الوجود ليس ميزة في ذاته بالنسبة للانسان والا فالذباب موجود، والعناكب السامة موجود، وان المزية هي الوجود على صواب... الوجود على مستوى الانسان وكل (واقع) ينحرف عن مستوى الانسان فهو خاطىء ولا يمكنه ان يكون صوابا بمجرد انه هو الموجود)[1].

واتە: (تەنها (بوون) نابێتە تایبەتمەندی، وە لێهاتووی نییە، خۆی لەخۆیدا بەنیسبەت مرۆڤ ئەگەر وابێ ئەوا مێشولەش بوونی هەیە و جاڵجاڵۆکەش هەروا. تایبەتمەندی و لێهاتوویی لەڕاستیدا لە بوونی دایە لەسەر ئاستی مرۆڤدا، هەر واقعێکیشی گۆڕا و لایدا لەئاستی مرۆڤ ئەوا هەڵەیە، ناگونجێ بڵێین ڕاست و تەواوە تەنها لەبەرئەوەی هەیە). دەمانەوێ بڵێین: فکری ئیسلامی بەپێی پێشکەوتنی کۆمەڵگە لە گشت بوارەکان هەنگاو دەنێت. تەماشای دابەزینی قورئان بکە، وەك کتێبەکانی تر بەیەك جار دانەبەزیوە، بەڵکو ڕەچاوی

---

(١) منهج الفن الاسلامي محمد قطب (ل ٧٦)

ئاستی هۆشیاری و پێشکەوتنی کومەڵگەی کردووە، لەگەڵ پەیدابوونی زانستی سەردەم تەفسیری فەرهەنگی و ژیاری بۆ قورئان سەریهەڵدا، لەگەڵ سەرهەڵدانی بوارە عەقڵی و لۆژیکی و فەلسەفیەکان تەفسیری ژمارەیی پەیدابوو.

کەواتە (واقیع) سەرچاوەیەکە لەسەرچاوەکانی فکری ئیسلامی، فکری ئیسلامی هەنگاوی نەناوە تەنها بۆ خزمەتکردنی موسڵمانان نەبێ لەبواری کۆمەڵایەتی و شارستانیەت و ژیار و فەرهەنگ و کلتور و ئابووری و ڕۆشنبیری هتد...، لەم خاڵەدا گەشەسەندن و پێشکەوتنی زانستەکانی تر، جگە لە زانستی شەریعە، لە ئەوروپا و ئەمریکا و ئاسیا، لەسەر تاکی موسڵمان (واجب) کرد شارەزاییان هەبێت بەم بنەما بنچینانەی ژیاری، ئەم سەردەمە هەڵقولاوی زانستە مرۆیی و تەکنەلۆژیەکانە. زانستی زمانی بێگانە بۆتە پێداویستی سەردەم. بۆ گەیاندنی ئیسلام بەجیهان وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (لە زەیدی کوڕی ثابتەوە) دەفەرموێت:

(قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أتحسن السريانية؟ انها تأتيني كتب، قال: قلن: لا، قال: فتعلمها، فتعلمتها في سبعة عشر يوماً)[1].

واتە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی زمانی سریانی دەزانی کتێبێکم بۆ هاتووە؟ گوتم نەخێر فەرمووی فێربە دەست بەجێ فێری بووم لە ١٧ ڕۆژاندا).

هەروەها پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بە زەید تا زمانی یەهود فێربێت زید دەفەموێ:

(أمرني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ان اعلم له كلماتٍ من كتاب يهود قال اني والله ما آمن يهود على كتاب، قال فما مرَّ بي نصفُ شهرٍ حتى تعلمتهُ له قال فلما تعلمتهُ كان اذا كتبَ الى يهود كتب اليهم واذا كتبوا اليهِ قرأت لهُ كتابة)[2].

---

(١) ئیمامی احمد گیراویەتیەوە .

(٢) ئیمامی ترمزی گیراویەتیەوە .

واتە: (پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردم چەند وشەیەکی جولەکەکان فێرببم لە نوسراوەکانی ئەوان، سوێند بەخودا جولەکەکان دڵنیا نەبوون لە نوسینی نوسراوەکانی خۆیان، ئینجا تێنەپەڕی بەسەرمندا نیوەی مانگ فێری زمانیان بوم، دوای ئەوەی فێری بووم هیچ کتێبێکی نەدەنووسی بۆ جولەکەکان ئیلا من دەمنوسی، ئەگەر ئەوانی کتێبیان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بنوسیبایە من دەمخوێندەوە بۆی).

لە (ئەثەری)شدا داهاتووە (من تعلم لغة قوم امن مكرهم) واتە (کەسێك فێری زمانی قەومێك بێت لە فێڵیان دڵنیا دەبێت)[1].

دیارە زانینی زانستە مرۆییەکان بۆتە پێداویستیەکی زۆر پێویستی ژیان، وەك: زانستی کۆمەڵناسی و ئەنثرۆپۆلۆجیا و دەروونناسی و سەرجەم زانستەکانی تر بەجیاوازی ڕەوتەکانی تر، هەروەها پێویستە شارەزایی فکری سەردەم بین لەگەڵ یاسا دەستکرد و ئایینە ئاسمانیەکانی تر وەك: کاسۆلیك و پرۆتستانت و بەهائی و قادیانی و بوزی و ماسۆنی و عەلمانیەت و فەلسەفەی سەردەم. ئاگادار لە حاڵەتی سیاسی جیهانی ئیسلامی و ڕۆژئاوا و ئەوروپا، جگە لەمانەش پێویستە ئاگاداری ئەوەبین پیلان و دژایەتێکی ئیسلام دەکرێت ئەو کتێبانەی لەسەری دەنوسرێت و چ بابەتێك دەوروژێنی، ڕۆژهەڵاتناسان چۆن باسی ئیسلام و موسڵمانان دەکەن لەگەڵ ئەوانەش زۆر پێویستە ئاگاداری (فقهى واقع) بین حاڵی ئێستامان جیاوازە لەگەڵ کاتەکانی تر، کاتێك دەوڵەت حوکمی قورئان پەیڕەو دەکات، زۆر جیاوازە لەوەی حوکمی عەلمانیەت ئێستا پەیڕەو دەکرێت، دیاریکردنی جۆری گرفتەکان لەگەڵ چارەسەری لەشێوازێکی (واقعي) و سەردەمیانە، لە ڕەوشتی بیرمەندی سەرکەوت و پێشکەوتنی موسڵمانە، ئەم شارەزاییانە (بەواقع) وا لە بیرمەند دەکات سەرکەوتوو بێت و هەنگاوی ژیرانە بەپێی سەردەم بهاوێژێت، چارەسەری دۆخەکە بکات بۆیە (واقیع) یەکێکە لەسەرچاوەکانی فکری ئیسلامی[2].

---

(١) بەدواداچونم بو ئەم وتەیە کرد نەم بینی کە فەرمودەی پیغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێت.

(٢) (مفهوم الفكر الاسلامی ومواجهه الحضارة الغربية (ل ٣٠)

# ڕێگاکانی بەدەست هێنانی زانیاری فکری ئیسلامی

فکری ئیسلامی لە ڕووی بەدەست هێنانیەوە لە قوتابخانە و بیردۆزەکانی تر تەواو جیاوازە، بۆ بەدەست هێنانی زانیاری پشت بە جیهانی پەنهان و بینین دەبەستێت (عالم الغیب والشهادە). بە پێچەوانەی قوتابخانەکانی تر تەنها ئاگاداری بینینن و پشتی پێ دەبەستن. خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴾[1]

واتە: (ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەکەن، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێئاگان).

بۆ تێگەیشتن لە مەنهەجەکانی فکری ئیسلامی و ڕێگاکانی بەدەست هێنانی زانیاری، دەبێ بزانین کە پەنهان و بینینەکان (الغیب والشهادة) تەواوکەری یەکترن بەو تەواوکاریە واتای ژیان و بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی و ئامانجەکانی دەزانرێت: بۆچی هاتوین؟ لەکوێوە هاتووین؟ پەیوەندی ژیان و مردن، بوون و نەبوون، ڕۆڵی مرۆڤ لەبوون، ڕۆڵی عەقڵ سنور و تواناکانی دیاری دەزانرێت. جیهانی پەنهان یان نادیار تایبەتە بە زانستی خودا:

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾[2].

پەیوەندی مرۆڤەکان بەجیهانی پەنهان بەپێی پێگەیشتنی ئیسلام پەیوەندی خێر و چاکە و بنیاتنانە بۆ بەدەست هێنانی دادوەری و چاکسازی و ڕاستی

---

(١) سورەتی الروم ئایەتی (٧)

(٢) سورەتی النمل ئایەتی (٦٥)

لە ژیاندا و بۆ ئاوەدانکردنەوەی ژیانە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ ﴾[١]
واتە: (بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان دەکات).

هەروەها دەفەرمویێت: ﴿وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا ﴾[٢]
واتە: (خودا داوای لی کردون کە زەوی ئاوەدان بکەنەوە).

## دەکرێ لێرەدا ئامانجەکانی جیهانی پەنهان و بێ بەخشەکانی بەمرۆڤ دیاری بکەین:

١- مرۆڤ بە گاڵتە و بێهودە دروست نەبووە خودای گەورە دەفەرمویێت:
﴿ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴾[٣]
واتە: (ئایا گومانتان وادەبرد کە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروستکردووە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!).

٢- گرنگترین بەخششەکانی جیهانی پەنهان بەمرۆڤ سەلماندنی بوونی خودای گەورەیە، کە دروستکار و بەدیهێنەر و تاك و تەنهایە.

٣- دونیا شوێنی کاروکردەوە و ئاوەدانکردنەوەیە، هەرچی لە بونەوەرە بۆ مرۆڤەکان ڕامکراوە،:
﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ ﴾[٤]
واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو

---

(١) سورەتی النحل ئایەتی (٩٠)
(٢) سورەتی هود ئایەتی (٦١)
(٣) سورەتی المؤمنون ئایەتی (١١٥)
(٤) سورەتی الجاثية ئایەتی (١٣)

زاتەوە). مرۆڤ جێنشینە لەسەر زەوی، هەوڵی ئاوەدانکردنەوە و چاکسازی بدات نەك تێك دان و لەناوبردنی.

٤- خودای گەورە بونەوەر و ژیان و دروستکراوەکانی دروست کردووە، لەسەر یاسایەکی کەونی رامی کردوون، بۆ ئەوە کە مرۆڤ عەقڵی تێدا بەکاربهێنێ و ئامانجەکانی تێدا بەدەست بهێنێ، (لعلکم تتفکرون).

٥- بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بەرپرسیاریەتێکی جێنشینە لەسەر زەوی، بونەوەری بۆ ڕام کراوە و هۆکاری وەدەست هێنانی وەك یاسایەکی ڕوون بۆ دیاری کراوە، تا دەستی پێوە بگرێ و هەنگاوی بۆ بهاوێژێ.



٦- (وەحی) سەرچاوەی سەرەکییە بۆ عەقڵ، هەردووکیان تەواوکەری یەکترن، بۆ ئەوە بەرپرسیاریەتی مرۆڤەکان دیاری بکەن لەسەر زەوی، بەم شێوەیە (وەحی) سەرچاوەی جیهانی پەنهانە و عەقڵیش سەرچاوەی بینینەکانە، بەهەردوکیان سەرچاوەی سەرەکی زانیارین لە فکری ئیسلامی، لەم ڕووەوە سەرجەم مەدەرسەکانی تر لە جیهانی پەنهان بێ بەشن، کە بڕوایان بە (نەقل) واتە: (وەحی) نییە[1].

کەواتە ڕێگاکانی بەدەست هێنانی زانیاری لە فکری ئیسلامیدا فراوانترە، چونکە پەنهان و بینینەکان لە فکری ئیسلامیدا تەواوکەری یەکترن.

کەواتە ریگاکانی بەدەست هێنانی زانیاری لەفکری ئیسلامیدا خۆی لەسێ سەرچاوەی سەرەکی دەبینێتەوە ئەوانەن:

١- عەقڵ.

٢- دڵ.

٣- پێنج هەستەوەرەکە.

--------------------------------

(١) ازمة العقل المسلم (ل ١٠٤)

## یەکـەم: عـەقــڵ

عـەقڵ ئەم بەخششە خوداییە کە مرۆڤـ لەسەرجەم بونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە. بەهۆی عـەقڵەوە مرۆڤـ لە دروستکراوە سەرپشکەکانە، بەهۆی عـەقڵەوە سەرجەم دروستکراوەکانی دونیا بۆی ڕام کراوە و ئەو سەردار و بەڕێوەبەریانە، لەگەڵ بەشەکانی تریشەوە لە لاشەی خۆی پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لەنێوانیان، هەر عـەقڵە ڕاستی و ناڕاستی لەیەك جیادەکاتەوە، دڵ ڕووناك دەکاتەوە، زانیاری ڕاستەقینە کۆدەکاتەوە، فکری ئیسلامی لەسەر بینا دەکات.

بۆیە ئیمامی جورجانی زۆر جوان بۆی چووە و پێناسەی کردووە و دەفەرموێت: (العقل: نور في القلب يعرف الحق والباطل )[١]

واتە: عـەقڵ نورێکە لە دڵەوە و هەق و ناهەقی پێ دەناسێتەوە، هەموو زانیاریەکیش سەرچاوە دەگرێت لە جیاکردنەوەی هەق و ناهەق. هەر لەبارەی پێناسەی عـەقڵەوە گوتراوە: (ما يعقل به حقائق الاشياء).

واتە: عـەقڵ ئەوەیە بۆ ڕاستی و دروستی شتەکانی پێ دیاری بکەی و تێی بگەی.

### کەواتە عەقڵ:

هۆکارێکە یان ئالیەتێکە بۆ وەبەرهێنانی هزروبیر و فکر بەگشتی، لە فکری ئیسلامی عـەقڵ ئامرازێکە بۆ تێڕامان و وردبونەوە لە (وەحی) و هەڵێنجاندنی زانستی و مەبەستەکانی، تێڕامان لە بونەوەر بۆ زانستی یاساکانی گەردوون.

-------------------------------

(١) التعريفات للجرجاني (ب١- ل١٩٧ )

## دووەم: دڵ

مەبەستمان لە دڵ ئەم پارچە گۆشتە نییە، کە لەلای چەپی سنگی مرۆڤە و ڕۆژانە چەندین لتر خوێنی بۆ بەشەکانی تری لەش دەنێرێت، بەڵکو مەبەست لە دڵ ئەم بەخششە خوداییە کە قورئان دەیان کاری زۆر گرنگی بۆ دیاری کردووە بەشێکیان دەخەینە ڕوو:

١- دڵ شوێنی باوەڕهێنانە تەنانەت باوەڕ بەبێ جێگیرکردنی لەناو دڵ قبوڵ نییە، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾[١]

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باغەمبارت نەکات ئەوانەی، کە بەپەلە بەدەم بێباوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی، کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان باوەڕی نەهێناوە .

٢- دڵ ناوەندی زیادوکەمی ئیمانە:

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَـٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾[٢]

واتە: (بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووهەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاددەکات، (سێهەم) (لە هەموو کار و بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن).

---

(١) سورەتی المائده ئایەتی (٤١)

(٢) سورەتی الانفال ئایەتی (٢)

٣- دڵ ناوەندی ترسانە لەخودا:

﴿ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴾[1]

واتە: (ئەوسا خوا ترسێكی فڕێدایە دڵیانەوە، بەناچاریی دەستیان كرد بەكاولكردنی خانووبەرەو ماڵەكانیان بەدەستی خۆیان و دەستی ئیمانداران، كەواتە: ئەی خاوەن بیروهۆش و دووربینەكان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەربگرن (جوولەكە هەروا بۆیان ناچێتەسەر)

٤- دڵ ناوەندی ئارامی لاشەو دەرونە:

﴿ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴾[2]

واتە: (ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەكەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەكان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بەئاینەكەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە).

٥- دڵ ناوەندی نەخۆشی مەعنەویە:

﴿ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴾[3]

واتە: (خوای گەورە بۆیە ئەو دەسەڵاتەی داوە بە شەیتان تائەو (خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەی ) شەیتان فڕێی دەداتە نێو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزاو تاقیكردنەوە بۆ ئەوانەی لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی دوو ڕوویی و ناپاكی هەیە و بۆ ئەوانەش، كە بەرامبەر ئایینی خوا دڵڕەقن، بەڕاستی ستەمكاران لە دژایەتی و شەڕەنگێزیەكی قووڵ و بێ بندا ڕۆچوون).

---

(١) سورەتی الحشر ئایەتی (٢)

(٢) سورەتی الرعد ئایەتی (٢٨)

(٣) سورەتی الحج ئایەتی (٥٢)

٦- دڵ كانگای ڕەق بوونە لەكاتی دووركەوتنەوەی مرۆڤ لە (ئیمان):

﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾(١)

واتە: (جا ئایا ئەو كەسەی كە خوای میهرەبان سینەی گوشار كردووە بۆ ئیسلام و لەسەر ڕێبازی نوور و ڕوناكی پەروەردگاریەتی، (وەك ئەو كەسە وایە كە پێچەوانەیە ؟) هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی كە دڵیان ڕەقە لەئاستی قورئان و یادی خوادا، ئائەوانە لە گومڕاییەكی ئاشكرادا گیریان خواردووە).

﴿ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴾(٢)

واتە: (پاشان لەوەدوا دڵەكانتان ڕەق بوو، (ئەی جولەكەكان) هەر وەك بەرد، بەڵكو ڕەقتریش چونكە بەڕاستی بەرد هەیە ڕووباری لێ هەڵدەقوڵێت، هەشیانە لەت لەت دەبێت و ئاوی لێ دێتە دەرەوە، هەشیانە لە ترسی خوا لە لوتكەی شاخەكان بەر دەبێتەوە، خوایش بێئاگا نییە لەو كاروكردەوانەی ئەنجامی دەدەن).

٧- دڵ یەكەم بەشە كە لەلاشە لە ئیمان دور دەكەوێتەوە بەكوێر وەصف دەكرێت:

﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴾(٣)

واتە: (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بە دڵ و دەروونێكی هۆشیارەوە تا بیرێك بكەنەوە (كوان : خەڵكانی ڕابوردوو ؟ ئەو شارانە بۆ كاولكران ؟ كێ ئێمەی دروست كردووە ؟ ئامانج لە ژیان ؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای

---

(١) سورەتی الزمر ئایەتی (٢٢)

(٢) سورەتی البقره ئایەتی (٧٤)

(٣) سورەتی الحج ئایەتی (٤٦)

بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بکەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بوویێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن، کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر رواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە).

٨- دڵ ناوەندی ترسان و مل کەج بونە بۆ خودای گەورە:

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾[١]



واتە: (ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیانهێناوە، دڵەکانیان بە نووری ئیمان ملکەچ و ڕووناك بۆتەوە، ترسی خوای تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی، کە ڕەوانەکراوە، وەك ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ رەوانەکرا، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دووردرێژ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، زۆربەشیان یاخی، و سەرکەش و نالەبار دەرچوون).

٩- دڵ ناوەندی بیرکردنەوەیە بەهاوکاری عەقڵ:

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾[٢]

واتە: ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون بەدڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە.. (کوان: خەڵکانی ڕابوردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروستکردووە؟ ئامانج لە ژیان چیە؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بوویێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن، کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە).

---

(١) سورەتی الحدید ئایەتی (١٦)

(٢) سورەتی الحج ئایەتی (٤٦)

١٠- دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەگوێ گرتنەوە هەیە:

﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ (١)

واتە: (ئایا دەریشنەکەوت بۆ ئەوانەی، دێن بە دوای دەستە و چینەکانی پێش خۆیان، پاش لەناوچوونی ئەوانەی کە تیایدا نیشتەجێ بوون، ئەگەر بمانویستایە، ئەوە بەهۆی گوناهەکانیانەوە تووشمان دەکردن (وەك چۆن خەڵکانی پێش خۆیانمان لەناوبرد) و مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن).

١١- دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە فێربوونەوە:

﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (٢)

واتە: (بەڵکو تەنها گلەیی و ڕەخنە لەسەر ئەوانەیە کە مۆڵەتت لێ دەخوازن و خۆ دەدزنەوە، لە کاتێکدا کە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووشن، ڕازین لەگەڵ پیرەژنان و پەککەوتواندابن و بمێننەوە، خوایش مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، بۆیە ئەوانە نازانن (خێر لە چیدایە).

١٢- دڵ پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ گشت بەشەکانی لاشەوە هەیە، ئەگەر چاك بوو سەرجەم کارەکان کە لاشە دەیکات چاك دەبن، ئەگەر خراپ بوو سەرجەم کارەکان کە لاشە دەیکات خراپ دەبێت. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ:

(الأ ان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب) (٣)

---

(١) سورەتی الاعراف ئایەتی (١٠٠)

(٢) سورەتی التوبە ئایەتی (٩٣)

(٣) متفق عليه.

واتە: ( ئاگاداربن بەراستی لەلاشەی هەریەکێتان پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە چاك بوو ئەوە هەموو لاشە چاك دەبێت، ئەگەر خراپیش بوو ئەوە هەموو لاشە خراپ دەبێت ئاگاداربن ئەمە دڵە).

ئەم ئایەت و فەرمودانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە پەیوەندی دڵ بەسەرجەم بەشەکانی لاشە دەردەخات، فکری ئیسلامی دەوڵەمەند دەکات و سەرچاوەیەکی زۆر سەرەکی وەدەست هێنانی زانیارییە لە فکری ئیسلامی.

کاتێك دڵ ناوەندی جێگیربوونی ئیمانە، ئیمانیش بڕیار لەسەر یەکتاپەرستی خودا دەدات. کەواتە دڵ ڕێگایەکی زۆر سەرەکی وەدەستهێنانی زانیارییە لە فکری ئیسلامی و ناکرێ فەرامۆش بکرێ.

## سێیەم: پێنج هەستیارەکەی مرۆڤ

ئەم پێنج هەستیارە وەسیلە و ڕێگان بۆ پەی بردن بە شتە ماددییەکان، گوێ هەڵدەستێ بەکاری گوێ گرتن و چاو بۆ بینین و لووت بۆ بۆنکردن و زمان بۆ تامکردن و پێست بۆ هەستکردن، ئەم هەستیارانە بۆ ئەوەی لەگەڵ جیهانی دەرەوە پەیوەندییمان هەبێ خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾[١]

واتە: (ئەی ئینسان) لەشتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە، کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە).

ئەم هەستیارانە گشتیان ئامرازن بۆ زانست و زانیاری سەرچاوەن بۆ فکری ئیسلامی.

-----------------------------

(١) سورەتی الاسراء ئایەتی (٣٦)

# بناغە و پایەکانی فکری ئیسلامی

زانیمان کە فکری ئیسلامی لەسەرچاوەی سەرەکی وەك قورئان و سونەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) هەڵێنجراوە، لەگەڵ ئەوەش چەندین بناغە و پایەی سەرەکی هەیە بۆ پتەوکردنی، چۆن بینایەك گەر بتەوێ زۆر بەهێز دروست بکرێت جوانیەکەی بدرەوشێتەوە، سەرنج ڕاکێش و جوان و سودبەخش بێ، پێویستی بە تەلارساز و ئەندازیار و نەخشەسازی بەتوانا هەیە، هەر لەسەرتاوە، بێگومان فکری ئیسلامیش پایەی زۆر بەهێزی وەك بناغە بۆ دانراوە، تا زانست و زانیاری خۆی لەسەر ئەم پایانە بینا بکات لەوانە:

## یەکەم: تاك و تەنهایی خودای گەورە

شتێکی زۆر سەرەتاییە بیرکردنەوەی مرۆڤەکان کاریگەری زۆری قوتابخانە فکریەکانی لەسەرە، قوتابخانەکانی سەردەم وەك مارکسیەت، سەرمایەداری، لیبراڵی و تەواوی قوتابخانە عەلمانیەکانی تر بیرکردنەوە، یان دەرهاویشتەی بنەما و بیرۆکەکانی ئەم قوتابخانەیەن، تاکی موسڵمان بیر و فکری ڕاست و دروست و تەواو نابێ تەنها بە بڕوابوون بەتاك و تەنهایی خودای گەورە، بەم پێیە بیرکردنەوەی فکری ئیسلامی لە قوتابخانەکانی تر جیاوازە.

موسڵمان لە هەموو جوڵەی ژیانی، لەبیرکردنەوەی، هەنگاوەکانی، تا دەگاتە ناخ و ویژدانی هەڵقوڵاوی ئیمان هێنانیەتی بەتاك و تەنهایی خودا، بیر و هزروفکری بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی ژیان لە کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، پەروەردە و فێرکردن، ژیاری و بەشەکانی تری ژیان پەیوەندی بە

بڕوا هێنانیەتی بەتاك و تەنهایی خودا، خودای گەورە لە قورئان دەیان ئایەت لەبارەی تاك و تەنهایی خۆیی و ئیمان هێنانی موسڵمانان بە یەکتایی خودا باس دەکات وەك دەفەرمویێت:

١- ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾[١]

واتە: (هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نییە، چونکە ئەوکاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوە و هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە بە بەرامبەر ئەو شتانەوە، کە (خوانەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن).

٢- ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾[٢]

واتە: (ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێکدەچوون بەسەریەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا، کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن: (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن).

٣- ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾[٣]

واتە: (بەفەرمانی خوا نەبێت هیچ خۆشی و ناخۆشیەك پێش نەهاتووە، جائەوەی باوەڕی تەواو بێنێت خوا دڵی ڕێنموویی دەکات بۆ لای خۆی، (هەر بارودۆخێکی بەسەردا بێت، لە خۆشی و ناخۆشی بە تاقیکردنەوەی دەزانێت) خوای گەورەش هەمیشە بە هەموو شتێك زانایە).

---

(١) سورەتی المؤمنون ئایەتی (٩١)

(٢) سورەتی الأنبیاء ئایەتی (٢٢)

(٣) سورەتی التغابن ئایەتی (١١)

## دووەم: جێ نشینیەتی مرۆڤ لەسەر زەوی

مەبەست لەجێنشینیەتی مرۆڤ لەسەر زەوی جێنشینی بەرێوەبردن و ئاوەدانکردنەوە و سەرپەرشتیاریەتی بونەوەرە لەلایەن مرۆڤەوە، مرۆڤ جێنشینە بۆ هەڵسوڕاندن و وەبەرهێنان و بەکاربردنی زەوی و ئەوەی تێدایە، لەسەر بنەمای ئەم ڕێزگرتنە کە خودا بە مرۆڤی داوە، هەنگاوی چاکسازی و ئاوەدانکردنەوە دەدات خۆی بە تاکە جێنشینی خودا دەزانێت و هەست بەبەرپرسیاریەتی دەکات، دەست بە هۆکارەکان دەگرێت، بونەوەری بەوەی تێدایە بۆ رامکراوە.
خودای گەورە دەفەرمویێت:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[١]

داوای کاری بەردەوامی لێکراوە، تا زەوی ئاوەدان بکاتەوە:

﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ ﴾[٢]

کردار و گوفتار و زانست سێ داواکراوی سەرەکین لە مرۆڤ داواکراوە، گشتی بۆ ئەم پلە بەرزەیە، کە خودا پێی داوە، بەبێ کرداروگوفتار و زانست ئەدایێ بەرپرسیاریەتی خۆی ناکات.

---

(١) سورەتی الجاثیة ئایەتی (١٣)

(٢) سورەتی التوبە ئایەتی (١٠٥)

## مەبەست و ئامانج لە جێنشینی مرۆڤـ لەسەر زەوی

١- مرۆڤ بەدرێژایی پەیدابوونی لەسەر زەوی پێویستی بە بەرێوەبردن و ڕێكخستنی كارەكانی بووە، لەنێوان خۆی لەگەڵ خۆیدا، خۆی لەگەڵ كۆمەڵگا، خۆی لەگەڵ خودا، بۆ ڕێكخستنی ئەم سێ تەوەرەیە جێنشینی پێ سپێردراوە، كە ئاوەدانكردنەوە و بەرپاكردنی حوكمی خودایە لەسەر زەوی، دادوەری كۆمەڵایەتی بووە، ڕێكخستنی كۆمەڵگاو پەیوەندییەكان كاری سەرەكی مرۆڤە بەتایبەتی دادگەری. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[١]

واتە: (ئەی محمد (صلى الله علیه وسلم) باسی ئەوە بكە لە دێرین زەماندا پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنیشینێك دابنێم (بۆ ئاوەدانی و دینداری)، فریشتەكان وتیان: ئایا كەسێكی تیادا دەكەیتە جێنشین كە فەسادی تیادا ئەنجام بدات؟! لە كاتێكدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەكەین و قەدر و ڕێزی تۆ چاك دەزانین و بە دوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین، (لە وەڵامیاندا) خوا فەرمووی: بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم).

هەر كاتێك مرۆڤ بەبەرپرسیاریەتی خۆی هەڵنەستابێ، ئەوا زوڵم و ستەم و نادادگەری و (فەسادی) لەنێو كۆمەڵگەكاندا بڵاوبۆتەوە، خودای گەورە لەناوی بردوون جارێكی تر جێنشینێكی تری داناوە بۆ هەمان مەبەست:

﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾[٢]

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (٣٠)

(٢) سورەتی یونس ئایەتی (١٤)

واتە: (پاشان ئێمە ئێوەمان کردە جێنشین لە زەویدا لەدوای لە ناوبردنی ئەوان، تا ببینن ئێوە چی دەکەن و چۆن دەکەن!).

﴿ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴾[1]

واتە: (جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم دین و بەرنامەیە، خوا کەسانی چاکتر لە ئێوە دەهێنێتە مەیدان، کە بەهیچ شێوەیەك لە ئێوە ناچن و وەك ئێوە نابن).

٢- بەرپرسیاریەتی دووەمی جێنشینایەتی مرۆڤ ئاوەدانکردنەوەی زەوییە. دانانی سیستەم، پێشخستنی ژیار، گەشەی ڕۆشنبیری، خۆشگوزەرانی مرۆڤەکان، پەیداکردنی ئاسانکاری بۆ ژیانێکی ئاسودە و خۆش.

﴿ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾[2]

واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ کرد لەم زەویەدا، دەسەڵاتمان پێبەخشین و جۆرەها هۆکاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندوون (لە خواردن و خواردنەوە و هۆکانی گواستنەوە و پۆشاك و ناوماڵ و ئاو و هەواو هتد...، کەچی لەبەرامبەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتە بێ شومارە سوپاسی کەمی نیعمەتەکان دەکەن، یان کەمتان سوپاسگوزارن).

لەبەر ئەم هۆکارانە خودای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە، تاوەکو خەڵك ڕێنوێنی بکەن بۆ بەرپاکردنی جوانترین سیستەمی سیاسی لە جیهان، وە بیرکردنەوە لە بونەوەر و خودی خۆیان:

﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ﴾[3]

واتە: (ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیرێکیان نەکردۆتەوە، کە خوا ئاسمانەکان و

---

(١) سورەتی محمد ئایەتی (٣٨)

(٢) سورەتی الاعراف ئایەتی (١٠)

(٣) سورەتی الروم ئایەتی (٨)

زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون؟).

ئەم بیرکردنەوەیە یەکێکە لە دیارترین هەنگاوی ژیاری و شارستانیەت.

٣- زانیمان جێنشینایەتی مرۆڤەکان بۆ ئاوەدانکردنەوە و دادوەری زەویە، پلەیەکی بەرزوبەڕێزە بە مرۆڤ دراوە، یان لەبەر گەورەیی مرۆڤەکان ڕەحم و بەزەیی و فەزڵی پێ بەخشیە، کە خودایە، یەکەم جێنشین لە مرۆڤ پێغەمبەر ئادەم بوو (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ). خوای گەورە پلەی جێنشینایەتی خۆی پێدا لەسەر زەوی بۆ سیاسەتکردن و بەڕێوەبردن و ڕێنوێنی کردنی مرۆڤەکان لەلایەن پێغەمبەرانی خودا.



**(ئیمامی کوفی) دەفەرموێت:** (وخليفة الله: كل نبي، استخلفهم الله في عمارة الأرض وسياسة الناس وتكميل نفوسهم وتنفيذ أمره فيهم، لا لحاجة به تعالى إلى من ينوبه، بل لقصور المستخلف عليه عن قبول فيه وتلقى أمره بغير وسط ، ولذلك لهم يستنبئ ملكا)[(١)]

واتە: (جێنشینی خودا: هەموو پێغەمبەرانن، خوای گەورە بەجێنشینی خۆی هەڵی بژاردوون، بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی و بەڕێوەبردنی خەڵك و تەواوکردنی لایەنی دەروونیان و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی لەسەر ئەواندا، بۆ ئەوە نا، کە خودا کاری پێیانە بۆیە بووە بەجێنشین، بەڵکو لەبەر کەموکوڕی جێنشینەکەیە تاوەکو قبوڵی زۆری کارەکان بکات بەبێ ناوبژی و نێوەند. هەر لەبەر ئەوەشە هەواڵ بە فریشتەیەك نەدراوە لەم ڕێگەیەوە).

٤- جێنشینایەتی مرۆڤ بە زانست و زانیاری دەبێت:

زانست لە (وەحی) و ئاوەدانکردنەوە لە مرۆڤ، هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە ئیلا خودا لەڕێگەی (وەحی)یەوە زانست و زانیاری فێرکردووە، زانست بنچینەی سیستەمی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی و ژیارییە، خودا دەفەرموێت:

-------------------------------

(١) الكليات للكوفي (ل ٣٠٦). چاپی دووەم مؤسسة الرسالة.

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾(١)

واتە: (ئینجا ئادەمی دروستکرد، ویستی توانایی و لێهاتوویی بۆ فریشتەکان ڕوون بکاتەوە، ناوی هەرچی پێویستی دەوروبەر هەیە فێری کرد، لەوەودوا بە فریشتەکانی ڕانواند و پێی فەرموون، ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن و توانای ئاوەدان کردنەوە زەویتان هەیە).

﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾(٢)

واتە: (ئەوسا خوا فەرمووی ئەی ئادەم، ئادەی تۆ ئاگاداریان بکە بە ناوەکانیان، جا کاتێك ئادەم هەواڵی ناوەکانی پێدان، خوا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن بەڕاستی من خۆم ئاگادارم بەنهێنی ئاسمانەکان و زەوی، دەشزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشارنەوە).

٥- دوای جێنشینایەتی (ئادم) (سلاوی خوای گەورەی لەسەر بێ). نەوەکانی بە پێی تەجروبە و مومارەسەی ژیانی ڕاست و ناڕاستیان لێك جیاکردوەتەوە، پشتیان بە زانست و زانیاری و بیروهزرو فکر بەستووە وەك لە بەسەرهاتی کوڕانی ئادەم بۆمان دەردەکەوێت.

﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ ۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾(٣)

واتە: (بەسەرهات و هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کە: بەڕاستی ڕوویداوە، ئەوەبوو کاتێك هەردووکیان قوربانییان کرد، لە یەکێکیان

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (٣١)

(٢) سورەتی البقرە ئایەتی (٣٣)

(٣) سورەتی المائدە ئایەتی (٢٧)

وەرگیرا (کە لەسەر هەق بوو، لە خوا ترس بوو) و لەوی تریان وەرنەگیرا، چونکە ڕق ئەستوور و حەسوود و خوانەناس بوو، بە براکەی وت: هەر دەتکوژم ئەویش لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا وتی: خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت).

٦- دوای کوشتنی هابیل لەلایەنی قابیلەوە لە کوڕانی ئادەم، دوبەرەکی پەیدابوو زاڵەکان سوربوون لەسەر زوڵم و زۆرداری و خۆ بە گەورە زانینی خۆیان، پەرستراویان بۆ خۆیان دیاریکرد (مەنهەجی) ڕاست و دروستی جێنشینایەتیان لەدەستدا، خودای گەورە بڕیاریدا پێغەمبەران یەك لەدوای یەك بنێری جارێکی تر حوکمی ڕاست و دروست و دادوەری خۆی لەسەر زەوی بەرپا بکات، مرۆڤەکان هیچ بەهانەیەکیان نەبێت لە ڕۆژی دوایی بڵێن: نەمانزانی یان بەهانەیەك بەێننەوە:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[1]

واتە: ( ئێمە سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین ).

﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾[2]

واتە: (پێغەمبەرانمان ڕەوانەکردووە، کە مژدەدەرن بە ئیمانداران و ترسێنەرن بۆ یاخیەکان، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان، دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون).

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[3]

واتە: (بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بە حەق و ڕاستیەکی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری ئیماندارانیت، ترسێنەری بێ بڕواکانیت، هیچ گەل ونەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادە و بێدار کەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت).

---

(١) سورەتی الإسراء ئایەتی (١٥)

(٢) سورەتی النساء ئایەتی (١٦٥)

(٣) سورەتی فاطر ئایەتی (٢٤)

یەکەم پێغەمبەر دوای ئادەم بۆ سیاسەت کردن و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات پێغەمبەر نوح بوو سەلامی خودای لەسەر.

٧- پێغەمبەر داود (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ) جێنشین بوو لەسەر زەوی گەیشتە حوکم و سەرۆکی دەوڵەت، دوای ململانێیەکی زۆر بەهێزی سیاسی لەگەڵ قەوم و گەلەکەی، تا گەیشتە چڵەپۆپەی حوکم و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، دەکرێ بڵێین: جگە لەوەی کە پێغەمبەر بوو سەرۆکی دەوڵەتی بەنی ئیسرائیل یش بوو.



﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴾[١]

واتە: (ئەی داود: بەڕاستی ئێمە تۆمان کردۆتە جێنیشین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوایی لەنێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام بدە، هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازی خوا).

دوای داود (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ)، پێغەمبەر سلێمان کاروباری وڵاتی گرتە دەست و فەرمان بەرداریەتی کرد بەپێی شەریعەتی خودا، بەڵکو جێنشین و مەلیکیش بوو، چونکە بەفەرمانی خودا چیا و با و باڵندەی بۆ رامکرا بوو جگەلە رامکردنی جنەکان.

٨- دوای ئەوە ماوەیەك و وچانێك کەوتە نێوان هاتنی پێغەمبەران، خەڵك کەوتنە گلەیی و گازاندە بۆچی موژدەدەرێك ترسینەرێکمان بۆ نایەت.

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞ ﴾[٢]

---

(١) سورەتی ص ئایەتی (٢٦)

(٢) سورەتی المائدە ئایەتی (١٩)

واتە: (ئەی خاوەنانی كتێب: بێگومان پێغەمبەرمان محمد (صلی الله علیه وسلم)، هاتووە بۆ لاتان تا هەموو شتێكتان بۆ ڕوون بكاتەوە، دوای ئەوەی كە ماوەیەك بوو هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوانە نەكردبوو (نێوان لەدایك بوونی عیسا و ناردنی محمد سەلامی خوایان لەسەر بێت، زیاتر لەشەش سەدەیە) نەوەكو بڵێن كەسمان بۆ ڕەوانە نەكرا تا مژدەدەر بێت بەچاكان و ترسێنەر بێت بۆ یاخیەكان، ئەوەتە بەڕاستی مژدەدەر و ترسێنەرتان بۆ هات، ئیتر هیچ بیانوویەكتان نەماوە).

ئەم وچانە هەندێك ڕایان وایە ماوەكەی (٤٠٠) ساڵ بووە، دوای ئەوا خودای گەورە دووبارە پێغەمبەرانی ناردوتەوە لەنێوان پێغەمبەر عیسا (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ)، لەگەڵ پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) (٥٧٠) ساڵی نێوان بووە. ئەم ماوەیە خەڵكان لەسەر پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو بوون بۆ بەڕێوەبردنی كارەكانیان.

٩- جێنشینایەتی پێغەمبەران كۆتایی هات بە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) كە جێ نشینی پەیام و پێغەمبەرایەتی بوو، دەستی پێكرد لە مەككە تا دەوڵەتی لە مەدینە دامەزراند، لەو سەردەمەدا سیاسەتی دونیا لەژێر چەتری ئیپراتۆریەتی هرقلی رومانی و كیسرای فارسی دا بوو، داوایان دەكرد (اذا أعطوا ما لقیصر لقیصر وما لله لله)[1]. لەگەڵ چەند دەوڵەتێكی بت پەرستی، خودا كۆتا پەیامی نارد لەگەڵ كۆتا پێغەمبەر.

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾[2]

واتە: (محمد باوكی هیچ كەس لە پیاوانتان نیە، بەڵكو پێغەمبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە).

دە ساڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك سەركردەیەكی سیاسی و پێغەمبەرێكی كۆتا دەوڵەتی مەدینەی بەڕێوەبرد.

---

(١) الكتاب المفرس العهد الجدید انجیل متی العباره (٢١)

(٢) سورەتی الاحزاب ئایەتی (٤٠)

**١٠-** دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆتایی بەهاتنی پێغەمبەران هات، جێنشینی مرۆڤ مایەوە بۆ سیاسەت و بەرێوەبردنی وڵات لەسەر مەنهەجی پێغەمبەران، وەك لە سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوون کراوەتەوە.

(عن ابی هريرة عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال (أن بني اسرائيل كانت تسوسهم الانبياء كلما هلك نبىٌ خلفهُ نبيٌ وأنهُ لا نبىٌ بعدى، وانهُ سيكون خلفاء فتكثر)[1] .

واتە: (بەڕاستی نەوەکانی ئیسرائیل لەلایەن پێغەمبەرانەوە دەوڵەتداری دەکرا و کاروباریان بەرێوە دەبردرا، هەر کاتێك پێغەمبەرێك بمردایە پێغەمبەرێکی تر شوێنی دەگرتەوە، لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نایەت، دوای من دەبێتە جێنشینایەتی و زۆر دەبێ).

دوای ئەوە جێنشینی راشد هاتن، کە چوار خەلیفەکەن **٣٠** ساڵ سیاسەتی وڵاتیان بەڕێوە برد و دەوڵەتداریان کرد، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی پێ کرد بۆ:

(خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤتى الله ملكة من يشاء)[2].

واتە: (جێنشینایەتی پێغەمبەرایەتی (**٣٠**) ساڵە دوای خودا مولکایەتی دەداتە ئەو کەسە، کە ویستی لەسەرە)[3]. فەرمانبەرداریەتی دوای ئەم (**٣٠**) ساڵە گۆڕدرا بۆ مولکایەتی، (**١٣**) سەدە بەردەوام بوو، تا ساڵی **١٩٢٤**. لەسەر دەستی مستەفا کەمال ئەتاتورك لە تورکیا بەبڕیارێك هەڵوەشایەوە و حوکمی (فصل الدين عن الحياة او فصل الدين عن الدولة) جیاکردنەوەی ئایین لە ژین، یان جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت،کە حوکمێکی عەلمانیە بڕیاری لەسەردرا و بەتەواوی حوکمی خودا لەسەر زەوی تا ئەم ساتە وەختەی ئێمە تێداین، کە

---

(١) بوخاری ومسلم گیراویانەتەوە .

(٢) ئەبو داودو ترمزی گیراویانەتەوە .

(٣) تعدد الاحزاب السياسية في الدولة الاسلامية المعاصرة (ل ٥٠)

دەکاتە (٩٠) ساڵ نەما. ئەوە مانا و مەبەستی جێنشینایەتی بوو سەردێکی مێژووی زۆر کورت، تا بەرچاومان ڕوون بێ و فکرمان ڕۆشن بێ، کۆتا کودەتا بەسەر شەریعەت لەڕێگەی فکری عەلمانی بوو، بۆیە شارەزابوون، بیناکردنەوە، بیر و هزروفکر بۆ ئەم سەردەمە لە فکری ئیسلامی باشترین چارەسەرە.

## سێ یەم: بەرپرسیارەتی ئەخلاقی



دوای دانان بە یەکتاپەرستی خودا و جێنشینایەتی مرۆڤەکان لەسەر زەوی هۆکار و ئەسالیبێکی تری ئەساسی فکری ئیسلامی بەرپرسیارەتی ئەخلاقییە، چۆن دوو خاڵەکەی تر، کە یەکتاپەرستی و جێنیشینێتی مرۆڤە جیابوون لەگەڵ سەرجەم فکروئایدۆلۆژیا و قوتابخانە دەستکردەکانی تر. لەخاڵی سێیەمیندا جیاوازیەکی یەکجار زۆر هەیە لەنێوان بنچینە و ڕێگاکانی فکری ئیسلامی لەگەڵ ئەوانی تر. بەرپرسیاریەتی ئەخلاقی لە فکری ئیسلامی ئەوە دەگەیێنێ تاك هەست بەبەرپرسیارەتی ئەخلاقی بکات لە هەڵسوکەوت و بڕیاروکاروبار و سیاسەت و ئابووری کۆمەلایەتی و ژیاری و بەرێوەبردن و پەروەردەوفێرکردن، تا دەگاتە نزمترین پلەی ژیان.

وەك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(عن نَافِعٍ عن بن عُمَرَ عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال ألا كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عن رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ الذي على الناس رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عن رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ على أَهْلِ بَيْتِهِ وهو مسؤول رعيَّتهمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ على بَيْتِ بَعْلِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عنه وَالْعَبْدُ رَاعٍ على مَالِ سَيِّدِهِ وهو مسؤول عنه، ألا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عن رَعِيَّتِهِ)[1]

واتە: (ئاگاداربن ئێوە هەموتان بەرپرسیارن، هەموتان لیپرسینەوەتان لەگەڵ

---

(١) سنن الترمذي (ب ٤/ ل ٢٠٨)

دەکرێت لەسەر بەر پرسیاریەتیەکەتان، ئەم پیشەوایەی بەر پرسە لەسەر خەڵك، لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر بەر پرسیاریەتیەکەیان، هەروەها پیاو بەرپرسە لەسەر خاو خیزانی، لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر بەر پرسیاریەتیەکەی، هەروەها ئافرەت بەرپرسە لەماڵی مێردەکەی، وەلێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەبەرپرسیاریەتیەکەی . بەندە بەرپرسیارە لەسەر ماڵی گەورەکەی، وەلێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر بەرپرسیاریەتیەکەی، ئاگادار بن هەموتان بەر پرسن وە هەموتان لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێت لەسەر ئەم بەرپرسیاریەتیە).



قوتابخانە فکریەکانی ئەم سەردەمە لەبەر لاوازی بەرپرسیارەتی ئەخلاقی لەکاروبارەکانیاندا لە سیاسەت و بەرێوەبردنیاندا، گەندەڵی و خیانەتکردن لە نیشتیمان و بەهەدەردانی سامانی، میللەتیان گەیاندۆتە لوتکە، مێژووی ئیسلامی ڕەنگ دەداتەوە لەوەی کە توانیویەتی مێژوویێکی پرشنگدار تۆماربکات لەهەستکردن بەبەرپرسیارەتی ئەخلاقی، تەناتەت لەگەڵ بەرامبەرەکانیشیان، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی ڕەهەندێکی بەهێزی جێنشینایەتی مرۆڤەکانە لەسەر زەوی، هیچ دروستکراوێك بەئەندازەی مرۆڤـ بەرپرسیارەتی قورسی نییە، گەیاندنی پەیام لەسەرشانی مرۆڤەکان داندراوە کە گەورەترین و قورسترین بەرپرسیارەتییە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴾(١)

واتە: (ئێمە ئەمانەتی (عەقیدە و بیروباوڕ، ئەمانتی سەرپشکیمان) نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان دا، (یاخود پێشنیارمان کرد کە ئێوە هەڵگری ئەم ئەمانەتە بن)، بەڵام هەمووان دەستیان پێوەناو ترسان لێی (هەر پێیان چاك بوو ئاوا (مسیر بن، سەرپشك نەبن) کەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی، بەڕاستی زۆر ستەمکار و نەفام بوو ).

بەرپرسیارەتی ئەخلاقی سەرچاوەی ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی و بەختەوەری

---

(١) سورەتی الاحزاب ئایەتی (٧٢)

گۆمەڵگایە، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی و ویژدانی و هەست و سۆز و ڕاستی و هەستی مرۆڤەکانە، جیهانی ئیسلامی لەدوای خەلافەتی ئیسلامی توشی گەورەترین قەیرانی دارایی بۆتەوە. گەندەڵی بەرێژەیەکی زۆر زیادی کردووە تەنها لەبەر لاوازی بەرپرسیارەتی ئەخلاقی بووە، فکری ئیسلامی ئەم خاڵە وەك سەرچاوەو وەسیلەیەکی سەرەکی دادەنێت بۆ بونیاتنانەوەی ژیان و گەشەی کۆمەڵگە، ئەمەش بوەتە دڵنیایی خۆڕاگری فکری ئیسلامی، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی گشتگیرە، گشت بەشەکانی ژیان دەگرێتەوە، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی سیاسی، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی ئابووری، بەرپرسیارەتی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی کلتوری هتد...، لەبەر گرنگی بەرپرسیارەتی ئەخلاقی خودای گەورە پلەی هەرەبەرزی لەم بابەتە داوەتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەوەی لەهەموو ڕووەکانەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە لوتکەی هەرە بەرزبووە بەڵام خودا بەم خاڵە وەصفی کردووە دەفەرموویت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾[1] واتە: (بەراستی تۆ لەسەر بەرزترین ئەخلاقی بەرزو بەرێزی).

کەواتە بەرپرسیارەتی ئەخلاقی خاڵی جیاکەرەوەی فکری ئیسلامی و تەواوی قوتابخانەکانی ترە.

(تورکیا، ئەستەنبول، اکسرا، ١٣ / ٤ / ٢٠١٥)

---

(١) سورەتی القلم ئایەتی (٤)

## بونیادنانی فکری

بەپێویستی دەزانم و کاتێکی گونجاوە لەم بەشەی سەرەتا باسی بونیاتنانی فکری بکەین، بەتایبەتی ئێمە دەمانەوێ باسی فکرەی ئیسلامی بکەین، بێگومان سەرچاوەی ئێمەش بۆ ئەم بابەتە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ تێگەیشتنی زانایان لە قورئان و سوننەت، کە پێی دەڵێن: (التراث الاسلامي)، فکر پەیوەندی هەمەلایەنی هەیە پێویست دەکات بونیاتنانی فکر گشت لایەنی پەیوەندیدار، کە پەیوەندییان بە فکر هەیە ڕوون بکەنەوە.

## پەیوەندییە فکریەکان:

فکر بەپێی کاریگەرییەکانی پەیوەندییەکی هەمەلایانی هەیە لەوانەی خوارەوە کورتیان دەکەینەوە:

١- پەیوەندی فکر بەخواناسی .
٢- پەیوەندی فکر بەقورئانی پیرۆز .
٣- پەیوەندی فکر بە سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .
٤- پەیوەندی فکر بە تەزکیە و زیکر .
٥- پەیوەندی فکر بە ئیمان .
٦- پەیوەندی فکر بە زانست .
٧- پەیوەندی فکر بە کردەوە و کردار .
٨- پەیوەندی فکر بە ئاوەدانکردنەوە (الاعمار) .
٩- پەیوەندی فکر بە ڕاپەرین وهەستانەوە (النهضة) .

## یەکەم: پەیوەندی فکر بە خودا ناسی

کاتێك خودای گەورە داوای باوەڕهێنان لە مرۆڤەکان دەکات، عەقڵ و بیروهزرو فکریان دەخاتە کاروتوویژی فکریان دەکات بۆ ئەوەی بەناسینێکی زۆر قوڵەوە خودا بناسن، دەیان ئایەتمان هەیە لەسەر بیرکردنەوە و هزروفکر، زیاتر لە (٢٠٠٠) جار لە قورئان باس لەناو و صیفات و وەصفی خودا هاتووە گشتیان بۆخودا ناسینە، سەرەتا بە (فکر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر ڕۆژانە دەچوو بۆ ئەشکەوتی (حیرا) کە بەرزترین کێوی دەوروبەری مەککەیە، بۆئەوەی لەوێ دروستکراوەکانی خودا ببینێ و بیر لە گەورەی خودا بکاتەوە و لەڕێی فکرەوە قوڵ بێتەوە لە ناسینی خودا و باوەڕهێنان، وەك دایکمان (عائیشە) دەفەرموویێت:

(أول ما بدئ به رسول (صلى الله عليه وسلم) من الوحي الرؤيا الصادقة في النوم، فكان لايرى رؤيا الا جاءت مثل فلق الصبح، ثم حبب الى الخلاء فكان يأتي حراء...)[1]

واتە: (سەرەتای دەسپێکردنی هاتنی (وەحی) بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەڕێگەی خەون بنینن بوو، هەر خەونێکی ببینیایە وەکو خۆری بەیانی بەراست دەگەڕا، لەدوای ئەوە بەتەنها بوونی لا خۆشەویست بوو. دەچوو بۆ چیای (حیرا) لەوێ چەندین شەو خەریکی خواناسی بوو، خواردن و پێداویستی دەبرد، کە تەواو دەبوو، دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە و دووبارە پێداویستی دەبردەوە، تا لە پڕێکا بەیانی بۆ هات لە ئەشکەوتی (حیرا).

-----------------------------

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە (٤٦٧١)، وە مسلم (١٦٠)

## دووەم: پەیوەندی فکر بە قورئان

لە پێشدا ئاماژەمان بەوە کرد، کە قورئان گرنگیەکی زۆری بە فکر داوە، لە (١٨) شوێنی جیا باسی فکر کراوە، بەسیفەی جیاجیا بەم شێوازی خوارەوە:

– **فکر** یەك جار هاتووە لە سورەتی (المدثر) (١٨)، ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾.

– **(يتفكروا)** دووجار هاتووە:

لە سورەتی الاعراف ئایەتی (١٨٤):

﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٌ﴾ .

لە سورەتی الروم ئایەتی (٨):

﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ﴾ .

– **(تتفكروا)** یەکجار جار هاتوە لە سورەتی سبأ ئایەتی (٤٦):

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ﴾.

– **(يتفكرون)** لەسورەتی الاعراف ئایەتی (١٧٦):

﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی یونس ئایەتی (٢٤) هاتووە:

﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (النحل) ئایەتی (١١):

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (النحل) ئایەتی (٤٤):

﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (النحل) ئایەتی (٦٩):

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (الروم) ئایەتی (٢١):

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (الزمر) ئایەتی (٤٢):

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ .

لەسورەتی الجاثية ئایەتی (١٣):

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەسورەتی (الحشر) ئایەتی (٢١):

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

– **(تتفكرون)** سێجار هاتووە:

لە سورەتی (البقره) ئایەتی (٢١٩):

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ .

لە سورەتی (البقره) ئایەتی (٢٦٦):

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾.

لە سورەتی (الانعام) ئایەتی (٥٠):

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾.

لەم چەند شوێنەدا، زۆر بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێ، کە قورئان چەند سیفەتی جیاوازی بەکارهیناوە بۆ بیرکردنەوە.

تەنها بیرکردنەوەیەکی سادەو خەتەرەیەکی فکری بەمێشك داهاتن نییە، بەڵکو هۆشیاری و هزری و بەدواچوون و قوڵبونەوەییە، خودای گەورە وێنەی جۆری

بیرکردنەوەمان بۆ دەکێشێت، بۆ هەردوو ژیانی دونیاو دوارۆژ.

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾[١].

لەم ئایەتە بیرکردنەوە لە دونیا و کاروباری دونیا و ئاوەدانکردنەوە و بەڕێوەبردن بەپێش دوارۆژ کەوتووە، دەردی کوشندە ئەوەیە تەنها بیر لە دونیا بکەیتەوە پشت لە ڕۆژی دوایی بکەی، یان بەپێچەوانەوە بیر لە دوارۆژ بکەیتەوە پشت لە دونیا بکەی.

دیارە جگەلە وشەی فکر چەند جارێکیش وشەی تر بەکار هاتووە لە شوێنی فکر وەك (التدبر) چەند جارێك لە قورئاندا هاتووە ڕێك بەمانای بیرکردنەوەیە. خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾[٢]

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[٣]

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾[٤]

چەند جارێکیش وشەی (الاعتبار) و (العقل) و (النظر) بەمانای بیرکردنەوە هاتوون.

## لە کوێی ئەم ئایاتانە چیمان بۆ دەردەکەوێ؟

١- بەکارخستنی فکر و بیر و هزری مرۆڤ .
٢- چۆنیەتی ڕێگاکانی بیرکردنەوە و شێوازەکانی .
٣- ئەو مادە و شتەی، کە بیری لێ دەکەیتەوە .
٤- ئامانجت لە بیرکردنەوە[٥].

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (٢١٩)
(٢) سورەتی النساء ئایەتی (٨٢)
(٣) سورەتی ص ئایەتی (٢٩)
(٤) سورەتی محمد ئایەتی (٢٤)
(٥) البناء الفكري د. فتحي حسن ملكاوي (ل ٢٥ )

## سێیەم: بەیوەندی فکر بە سونەت و فەرمودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

یەکێك لە دیارترین وەزیفە كانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ڕوونكردنەوەی قورئان و جێبەجێكردن و شیكردنەوەی بوو لەسەر (ئەرزی واقیع)، خوای گەوەرە دەفەرموێت:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[١]

واتە: ( ئێمە قورئانمان بو دابەزاندی بۆ ئەوەی بۆ خەڵك رونی بكەیتەوە، ئەوەی بۆت دابەزیوە، وە بۆ ئەوەی بیری لێبكەنەوە).

بێگومان لە فەرمووەدەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چەند جارێك باسی فكر و هزر كراوە، شیكردنەوەی ئایەتەكانی قورئان بووە، كە بیركردنەوەیە، وەك لە (ئیبن حبان)دا هاتووە (عبیدی كوری عمید) دەفەرموێت: دایكی ئیمانداران (عایشة) خوا لێی ڕازی بێت، هەواڵم پێ بدە بەو شتەی، كە زۆر سەرسوڕهێنەر بێت، بینی بێتت لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). بەشێك لە فەرموودەكە بەم شێوەیە:

(فجاء بلال يؤذنه بالصلاة، فلما رأه يبكى قال: يارسول الله لم تبكى، وقد غفر الله لك ما تقدم وما تأخر، قال : أفلا أكون عبدا شكورا؟ لقد نزلت على الليله ايةً، ويل لمن قرأها ولم يتفكر فيها[٢].

﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[٣]

---

(١) سورەتی النحل ئایەتی (٤٤)

(٢) ئیبن حبان گیرایتیەوە .

(٣) سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩٠ - ١٩١)

واتە: (بیلال) هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگ بدات بۆ نوێژ، کاتێك پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم)ی بینی دەگریا. گوتی ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆچی دەگریت؟ لەکاتێکدا خودا لە گوناهی پێشین و دواینیشت خۆش بووە؟

فەرمووی: ئایە نابێ بەندەیەکی شوکر بژێربم؟ بەڕاستی ئەم شەو ئایەتێك بەسەرم دابەزیوە، ماڵ وێرانی بۆ ئەو کەسەی دەیخوێنیتەوەو بیرو فکری لێ ناکاتەوە، ئینجا ئایەتەکەی خوێندەوە.



لەم ئایەتەدا باس لە فکر و بیرکردنەوە هاتووە لە ئاسمان و زەوی و شەو و رۆژ، فکر و بیرکردنەوەش بەڕاوەستاوی، یان بەدانیشتن، یان پاڵدانەوە داواکراوە، هیچ حاڵەتیك نییە لە ژیانی تاك خاڵی بێت لە فکروهزر و بیرکردنەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕاستەوخۆ ئاماژەی بە بیرکردنەوەیەکی زۆر فراوان کردووە دەفەرموێت:

(تفكروا في كل شيء، ولا تفكروا في ذات الله)[١]

واتە: (بیر لەگشت شتێك بکەنەوە، بیر لەزاتی خوا مەکەنەوە).

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت:

(ففكرت في نفسي فعرفت أن الدنيا منقطعة زائله)[٢]

واتە (بیرم لە دەروونی خۆم کردەوە زانیم، کە دونیا دەبڕێتەوە و لەناودەچێ).

---

(١) فتح الباري شەرحی صحیح البخاري. ژمارەی فەرموودە (٧٤٠٢- ب ١٣) (ب ١٤- ل ٣٢٦)

(٢) مسند احمد بن حنبل، فەرموودەی ژمارە ( ١٦٦٩٥ ل ١١٨٤)

## چوارەم: پەیوەندی فکر بە تزکیە و زکر و دڵ

کاریگەری فکر تەنها لەسەر لایەنی دەرەکی نییە، بەڵکو کاریگەرییەکانی لەسەر دڵ و دەروون و ناخی تاك هەیە، بۆ شیکردنەوەی پەیوەندی فکر بە تەزکیە و زکر و دڵ، وتەیەکی جوان و پڕ مانای (ئیمامی غەزالی) لە ( احیاء علوم الدین) دا بە نمونە وەردەگرین.

کەوا دەفەرموێت: (وأما ثمرة الفكر: فهي العلوم والأحوال والأعمال، ولكن ثمرته الخاصة العلم لاغير، نعم إذا حصل العلم في قلب تغيرت إعمال الجوارح، فالعمل تابع الحال، والحال تابع العلم، والعلم تابع الفكر، فالفكر إذا هو المبدأ والمفتاح للخيرات كله، وهذا هو الذي يكشف لك فضيلة التفكر، وانه خير من الذكر والتذكر، لأن الفكر ذكر و زيادة ... فاذا التفكر أفضل من جملة الاعمال، فمنها خمس درجات:

**اولاها:** التذكر وهو احضار المعرفتين في القلب

**وثانيها:** التفكر وهو طلب المعرفة المقصودة منهما

**والثالثة:** حصول المعرفة المطلوبة وإستنارة القلب بها

**والرابعة:** تغير حال القلب عما كان بسبب حصول نور المعرفة

**والخامسة:** خدمة الجوارح للقلب بحسب ما يتجدد له من الحال[1]

واتە: (بەروبومی فکر: بەروبومی زانست و حاڵوباڵ و کردەوەکانە، بەڵام بەروبومی تایبەتی زانستەو بەس، بەڵێ ئەگەر زانست لە دڵ بەرجەستە بوو حاڵی دڵ دەگۆڕێ، ئەگەر حاڵی دڵیش گۆڕا حاڵی دەست و پێوەندەکانیش دەگۆڕێت، کردەوە دواکەوتەی حاڵە، حاڵیش دواکەوتەی زانستە، زانستیش دواکەوتەی فکرە، کەواتە فکر سەرەتا و کلیلی هەموو چاکەکانە، ئەوەیە پلەو پایەی بیرکردنەوەت بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەراستی بیرکردنەوە خێری لە یاد و

---

(١) احياء علوم الدين ابو حامد الغزالي (ب ٥ ل ٣٤)

یادکردنەوە زیاترە، چونکە فکر یاد و یادکردنەوەیە و لەوەش زیاترە. کەواتە بیرکردنەوە بەگشتی باشترە لە کردەوەکان.
پێنج پلەی هەیە:

**یەکەم:** یادکردنەوە، ئامادەکردنی دوو زانیاریە لە نێو دڵ .
**دووەم:** بیرکردنەوە، ئامادەکردنی زانیاری مەبەستە لە هەردووکیان .
**سێیەم:** وەدەست هێنانی زانیاری داواکراو بەبیرکردنەوە و ڕووناك بوونی نێو دڵ.
**چوارەم:** گۆڕینی حاڵی دڵ بەهۆی بەدەست هێنانی تشکی زانیاری .
**پێنجەم:** خزمەتکردنی دڵ لەلایان دەست و پەیوەندییەکان بەپێی نوێبوونەوەی حاڵەکان.

**(ئیمامی غەزالی)** زۆر بە قوڵی پەیوەندی فکری بە دڵ و تەزکیەوە دیاری کرد، بۆمان دەرکەوت پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لەنێوان فکر و دڵ و تەزکیە.

**(ابن القیم)**قوڵتر دەچێتە نێو شیکردنەوەی پەیوەندی فکر بە تەزکیە و زکر، لەئەنجامی وردبوونەوەی لەم چەند ئایەتە لە قورئاندا لە سورەتی (النحل):

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴾[1]

ڕونی دەکاتەوە دەڵێت: پێگەی بیرکردنەوە لەم ئایەتەیە. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ .

پێگەی عەقڵ لە ئایەتی. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾ .

لە کۆتاییدا پێگەی بیرکردنەوە لەم ئایەتە دیار دەبێت ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴾ .

---

(١) سورەتی النحل ئایەتی : (١٠ -١٣) .

**(ئیبن قەییم)** دەڵێت: بەنسبەت تایبەتکردنی ئەم بابەتە بە ئەهلی یادکـردنەوە، شێواز و چۆنیەتی دیاریکردنی ئەم بابەتە لە قورئانەوە، کە نیشانەیەك بگێڕی بۆ وردبونەوە و تێڕوانین و یادکردنەوە .
وەك ئەوەی خودای گەورە لە سورەتی (ق) دەفەرموێت:

﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴾[١]

لێرەدا وردبوونەوە و تێڕامان بەمانای (تعقل) عەقڵ وەرگرتن (التذکر) یادکردنەوە دێت، فکریش دەروازەی هەموو ئەوانەیە، ئەگەر بیری کردەوە تێ دەڕوانی، ئەگەر تێیڕاما یاد دەکاتەوە، لە درێژەی ئایەتەکە یەکەم جار فکری باسکرد، چونکە دەرگایە لە ناوەڕاستی، عەقڵ وەرگرتنی باسکرد چونکە بەروبومی فکرە، لەکۆتاییدا یادکردنەوەی باسکرد چونکە ئەمەیە داواکراوی فکر و عەقڵ، بۆیە جوان لێیان وردبەوە[٢].

---

(١) سورەتی ق ئایەتی (٧-٨) .

(٢) مفتاح دار السعاده. ابن القیم الجوزیة (ل ٦٠٦)

## پێنجەم: پەیوەندی فکر بە ئیمان

دامەزراندنی ئیمان لەنێو دڵ چەند هەنگاوێکی پێشینەی دەوێت، مادام ئیمان کاتێك دامەزرا گۆڕانکاری بەسەر لاشە و بیر و فکر و تێڕوانین و هەڵسوکەوت سەرجەم بابەتەکانی تردا دێنێت، مادەم ئیمان ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر دەست و پەیوەندییەکان، هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی ئیمان بریتیە لە فکر.

**(ئیبن قەییم)** زۆر بەوردی ئەم بابەتەی لە کتێبی (الفوائد) ڕوون دەکاتەوە لەژێر ناونیشانی، (قاعدة نافعة) دەڵێت:

(أصل الخير والشر من قبل التفكير ـ فإن الفكر مبدأ الإرادة والطلب في الزهد والترك والحب والبغض ـ وأنفع الفكر هو الفكر في مصالح المعاد ـ وفي طريق اجتلابها وفي دفع مفاسد المعاد وفي طرق اجتنابها ـ فهذه أربعة أفكار هي أجل الأفكار ـ ويليها أربعة فكر في مصالح الدنيا وطرق تحصيلها، وفكر في مفاسد الدنيا وطرق الاحتراز منها ـ فعلى هذه الأقسام الثمانية درات أفكار العقلاء)[١]

واتە: (سەرچاوەی هەموو خێر و شەڕێك لەبیرکردنەوەدایە، بەڕاستی بیرکرنەوە بنەمای ویست و خواست و داواکردنی دونیا نەویست و دەست لێ هەڵگرتن و خۆشەویستن و ڕق لێبونەوەیە. بەسوودترین فکر، فکرکردنەوەیە لە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژی دوایی و ڕێگا بۆ کێشانی، دورخستنەوەیە لە خراپەکاریەکانی ڕۆژی دوایی و دوورکەوتنەوە لێیان، ئەم چوار فکرەیە دیارترینی فکرەکانن، چواری تریشی بەدوا دادێت، فکرێك لەبەرژەوەندییەکانی دونیا و ڕێگاکانی وەدەست هێنانی، فکرێك لەخراپەکارییەکانی دونیا و ڕێگای خۆدەربازکردنی، لەسەر ئەم هەشت بەشە فکری عەقڵمەندان دەسوڕێتەوە.

ئەو گەلە وشانەی قورئان بەکاری هێناوە، وەك: (التفكر، التدبر، التعقل، النظر، الفقه، الاعتبار هتد...) دوای کۆمەڵێك باس و (وەصفی) بواری جیاجیا دێت، وردبەوە لە قورئان باسی بونەوەر دەکا زیاتر لە (١٣٠٠) ئایەت هاتووە

---

(١) الفوائد. ابن القيم الجوزية (ل ٢٤٢)

باسی قۆناغەكانی دروستبوونی مرۆڤ دەكات، جیاوازی شەو و ڕۆژ، چۆنیەتی و دروستبوونی زەوی و ئاسمان، لانەی زەوی، گژوگیا گەشەكردن، گیاندار و دار و درەخت، مێژوو شارستانیەكانی پێشوو، بەسەرهاتی پێغەمبەران و فیرعەونەكان و ستەمكارەكان . وەك (شێخ الإسلام ئیبن تەیمیە) دەفەرمویێت: مەبەستی سەرەكی پەند وەرگرتنە، لەكۆتاییدا دەستت دەگرێت و ڕاتدەكێشێ بۆ باوەڕهێنان بەخودای تاك و تەنیا بە ناوە جوان و (صیفەتە) بەرز و بەڕێزەكانی.

دوای ئەم هەموو هەوڵ و كۆششە لە بیركردنەوە و یادكردنەوە، گەر مرۆڤ پەند وەرنەگرێ، بینای فكر و زانست و تێگەیشتن نەكات، لەوە ڕانەمێنێ ئەم هەموو یاسا و ڕێسا و بیردۆزانە لەكوێ هاتووە، چ بەهایەكی هەیە ئەم زانست و زانیارییە دۆزراوانە ئەگەر خاوەنەكەی كاری پێنەكات، ژیانی مرۆڤەكانی پێ خۆش نەكات، هەڵگری پەیام نەبێت، خۆی بەجێنشین نەزانێ.

بازرگانی و پیشەسازی و كشتوكاڵ و دانەری یاساكان و ڕێكخەری سیستەمی ژیان لە نێوان تاك و كۆمەڵ و وڵاتدا، كاروباری كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و هەموویان بە سوودن، بەڵام چ سودێكی هەیە دوای ئەم هەموو كۆشش و فكر كردنەوەیە نەگەیەنە باوەڕهێنان بە خودای گەورە، كەسانێك هەن خاوەنی زانست و تەكنۆلۆژیای سەردەمن، بەڵام غروری و خۆبەگەورەزانی و بێ ئاگای لە ئیمان، وای لێكردوون سود وەرنەگرن تەنها زانستی دونیای بزانن.

﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ ﴾[1]

واتە: (ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەكەن، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێ ئاگان، ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیرێكیان نەكردۆتەوە، كە خوا ئاسمانەكان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەكردوون؟).

---

(١) سورەتی الروم ئایەتی (٧)

لەوانەیە ئەوانە ڕێژەیان یەکجار زۆربێت. ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾[(١)]
واتە: (بەڵام زۆربەی خەڵکی بەمە نازانن).

جێگای داخە، ئێستا لەم سەردەمە هەرچی زانستی دونیایە لەئەنجامی بیرکردنەوە بێ باوەڕەکان بەدەستی دەهێنن! لە بنەڕەتدا دەبوو موسڵمان زانستی دونیا و دوا ڕۆژ بە دەست بێنن، ئەگەر زانستی دونیا موسڵمان بەدەستی بێنابا خزمەتی ئایین و ژینی خەڵکی دەکرد بەگشتی، خودای گەورە فەرمانی کردووە، کە زانستی دونیا بەدەست بێنن بەپێی فەرمانی خودا کاری پێبکەن.

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ ﴾[(٢)]



واتە: ((خوا فەرمان دەدات بەکار بەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام): هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەیی بکەن، (هێزی ئاسمانی و دەریایی و وشکانی.. هتد) و لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکانی تری گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن، تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن).

ئێستا بەهۆی فکرەوە ڕۆژئاوا زانستی سەردەمی بەدەست هێناوە، دونیای پێ کردۆتە یەکپارچە ئاگر، سارد و گەرم، گەورە و بچوك، تاوانبار و بێتاوان بەیەکەوە دەسوتێنی. فەساد بڵاودەکاتەوە، زوڵم و ستەمی پێ ئەنجام دەدات، خوێنی مرۆڤەکان دەمژێت!

﴿ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ ﴾[(٣)]

واتە: (تاوان و خراپە دەرکەوتووەو هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە، کە خەڵکی دەستیان داوەتێ).

---

(١) سورەتی الأعراف ئایەتی (١٨٧)

(٢) سورەتی الأنفال ئایەتی (٦٠)

(٣) سورەتی الروم ئایەتی (٤١)

کەچی موسڵمانان (١٣) سەدە خاوەنی هەموو زانستی دونیا و دواروژ بوون! نەك موسڵمان، بەڵکو جولەکە و مەسیحی و بوزا و سەرجەم ئایینەکانی تر لەژێر چەتری ئەم زانستەدا خۆشترین ژیانیان بەسەربرد، لە ئاسایش و خۆشی و ئازادی دابوون، ئەگەر ئێستاش موسڵمان، واز لە بێئاگایی لە زانستەکانی سەردەم بێنن و دووبارە خۆی ببێتەوە خاوەنی، کە هەر لە سەرەتاوەش هەرخۆی خاوەنی بووە:

﴿هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَا﴾[(١)]



واتە (ئەوەتە ئەمانە کەل و پەلی خومانە گەرێندراوەتەوە بۆمان ). ئەوا ئایەتە گەردوونی و دەروونی و کومەڵایەتی و مێژوویی و ژیارییەکان جارێکی تر دەبوونە ڕێکخەری ژیانی مرۆڤەکان بەگشتی. خودای گەورە کاتێك لەمەقامی زەم باسیان دەکات، چونکە پشتیان لەدوارۆژ کردوە:

﴿وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ﴾[(٢)]

واتە: (ئەوان لەکاروبارو حالی دوارۆژ بێ ئاگان).

بۆیە بەڕاستی فکر پەیوەندییەکی یەکجار زۆری بە ئیمانەوە هەیە.

---

(١) سورەتی یوسف ئایەتی (٦٥) .

(٢) سورەتی الروم ئایەتی (٧) .

## شەشەم: پەیوەندی فکر بە زانست

پێمان سەیر نەبێ فکر ئەوەندە فراوان و هەمەلایەنەیە، پەیوەندی بەهەموو بەشە سەرەکیەکانەوە هەیە! ئایین لە تێڕوانینی ئیسلامی لە بنەڕەتدا ئیمان و زانست و کردارە، باشە فکر لە کوێی ئەم سێ چەمکەدایە؟ لەدرێژەی باسەکەمان کە لەپێشدا باسمان کرد، فکر وەك بنەمای سەرەکییە، گوتمان: فکر سەرچاوەیە بۆ ئیمان، ئیمانیش ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەزانست، لەقورئاندا زۆر باسی ژمارە دەکرێت. دەکرێت بڵێین: ڕاستە و هەڵەیە، بەڵام زۆرجار ژمارەی هاوشێوە لەنێوان دوو چەمك هەیە، سەرنجت ڕادەکێشی. بۆ نموونە، (٨١١) جار لە قورئاندا باسی وشەی ئیمان و لێوەرگیراوەکانی هاتووە، (٧٨٢) جار باسی زانست و لێوەرگیراوەکانی هاتووە، (٢٩) جار باسی ماریفەت (معرفة) و لێوەرگیراوەکانی هاتووە، دەکاتە (٨١١) جار، هاوشێوەی وشەی ئیمان ئەمە بێ حیکمەت نییە دەکرێ بڵێین ئیماندار دەبێ زانا بێت[1].

کەواتە ئیمان و زانست، تەواوکەری یەکترن، ئیمانش بناغەکەی فکرە. پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێداوە، دەفەرموێت: (یەزیدی کوڕی عومەیرە) دەفەرموێت: کاتێك (مەعازی کوڕی جەبەل) لەسەرە مەرگ بوو، گوتیان ئەی (باوکی عەبدولرەحمان) ئامۆژگاریمان بکە، فەرمووی: دانیشن ئینجا گوتی بەڕاستی زانست و ئیمان تەواوکەری یەکترن، هەرکەس دەستیان پێوەبگرێ بە دەستیان دێنێت، سێجار ئەوەی دوبارەکردەوە[2].

بەڵام لەبیری نەکەین کام زانست ئەم زانستەی کە قورئان بەشێوەیەکی یەکجار فراوان باسی کردووە، کە (شمولی) زانستی سروشتی و (ماددی و سلوك) و دەروون و کۆمەڵناسی و مرۆیی و بیروباوەڕ و فقە و مامەڵەکردن و ئەندازیاری و پزیشکی و ئاوەدانکردنەوە و - تەواویی زانستەکانی تر دەکات. لەگەڵ ئەوەش

---

(١) الاعجاز العددي في القران الكريم - نوفل عبدالرزاق (ل ٥٦)

(٢) المستدرك على الصحيحين (ب ١ - ل ١٤٦)

زانستی سەرەکی و هەرەبەرز ناسینی خودایە، ڕێی ڕاستەقینەی ئیسلامە، تێگەیشتنی قورئانە، جێبەجێکردنی فەرمایشی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم). خودای گەورە پێغەمبەرانی هەریەك بەشێوازێك فێری جۆرێکی تایبەت لە زانست کردووە لەوانە:

١- پێغەمبەر (یەعقوب)ی (سڵاوی خوای لەسەر بێت)ی فێری کۆمەڵێك زانست کرد:

﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾(١)

واتە: (بەڕاستی یەعقوب خاوەنی زانستێك بوو، چونکە ئێمە فێرمان کردبوو، بەڵام زۆربەی خەڵکی ڕاستەیەکان نازانن).

٢- پێغەمبەر سولەیمانی (سڵاوی خوای لەسەر بێت) فێری زمانی باڵندەکان کرد:

﴿وَوَرِثَ سُلَيۡمَٰنُ دَاوُۥدَۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمۡنَا مَنطِقَ ٱلطَّيۡرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيۡءٍۖ﴾(٢)

واتە: (سولەیمان جێنشینی داودی باوکی بوو، ڕۆژێك وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێری زمانی باڵندە کراوین و لە هەموو شتێکمان پێدراوە ).

٣- پێغەمبەر داود (سڵاوی خوای لەسەر بێت) فێری دروستکردنی ئالەتی جەنگ کرد:

﴿وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ﴾(٣)

واتە: (هەروەها ئێمە داودمان فێری دروستکردنی زرێ و قەڵغان کرد، تا لە توندو تیژی کاتی شەڕ بتانپارێزێت).

---

(١) سورەتی یوسف ئایەتی (٦٨)

(٢) سورەتی النمل ئایەتی (١٦)

(٣) سورەتی لانبیاء ئایەتی (٨٠)

٤- پێغەمبەر یوسف (سڵاوی خوای لەسەر بێت)ی فێری خەون لێکدانەوەی کرد:

﴿ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ ﴾[1]

واتە: (یوسف) وتی: (من تەنها لێکدانەوەی خەون نازانم، بەڵکو جگە لەوەش) هیچ خواردنێکتان بۆ نایەت، کە دەرخواردتان بدرێت کە من نەزانم چیە و چۆنە؟ پێش ئەوەی بگاتە لاتان (ئەمەش ئازایەتی خۆم نیە) بەڵکو ئەوە هەندێکە لەوەی پەروەردگارم فێری کردووم).

٥- (ذوالقرنين) فێری کاری ئەندازیاری کرد:

﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا ﴾[2]

واتە: ((ذو القرنين) وتی: ئەو دەسەڵات و زانیاری و شتانەی پەروەردگارم پێی بەخشیووم چاکترە بۆ من (لە پارە و سامان) جا ئێوە بەهێزی بازوو یارمەتیم بدەن، تا بەربەستێکی بەهێز لە نێوان ئێوە و ئەواندا دروستبکەم. پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵەکەی بکەن) هەتا ئەمبەرو ئەوبەری هەردوو کێوەکەی پڕ کرد، ئەوسا فەرمانیدا، تا بە (موشەدەمە) فوو بکەن لەو ئاگرەی، کە لە ژێریدا کرابۆوە، هەتا کاتێك هەمووی کرد بە ئاگر، ئینجا (ذو القرنين) وتی: ئادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن، تا بیکەم بەسەریدا)).

٦- پێغەمبەر نوح (سڵاوی خوای لەسەر بێت)ی فێری دروستکردنی بەلەم و کەشتی کرد:

﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴾[3]

واتە (کەشتییەکەش دروست بکە بەچاودێری و فەرمانی ئێمە، (کاتی تۆفانەکە)

---

(١) سورەتی الانبياء ئایەتی (٨٠)

(٢) سورەتی الكهف ئایەتی (٩٦)

(٣) سورەتی هود ئایەتی (٣٧)

تکامان لێ نەکەیت بۆ ئەوانەی لە سنووری ڕاستی دەرچوون و تاوانبارن، چونکە بەڕاستی ئەوانە بڕیاری خنکاندن و تیاچوونیان بۆ دراوە).

٧- بەرزترین پلەی زانستی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەخشی، ئەویش فێری خوێندنەوە و زانست بوو، فەرمووی:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴾[١]



واتە: (ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە، کە هەموو شتێکی دروستکردووە. ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروستکردووە. بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە. ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی و زانیاری فێر کردووە. ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە، کە نەیزانیوون).

**(ئیبن قەییم)** دەفەرموێت: بەرزترین شت، کە مرۆڤ بەدەستی بهێنێ دڵ پێی بگات، بەندە پێی بەرزببێتەوە لە دونیا و دوارۆژ زانست و ئیمانە، خودای گەورەش بەیەکەوە باسی کردووە:

﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴾[٢]

واتە: (لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە).

ئەمانە هەڵبژاردە و ناوەرۆك و کاکڵی کۆمەڵگەن[٣]. دیارە زۆر هەڵە دەکەن ئەوانەی دەڵێن بیرکردنەوە و زانست بۆ توێژێکی تایبەتن پەیوەندی بە ئیمانەوە نییە، نێوانی فکر و زانست و ئیمان ناتوانێ دیاری بکەی، چونکە تەواوکەری یەکترن، بەیەکەوە گرێدراون، ئیمانداری بەهێز خاوەن فکر و زانستی بەهێزە[٤].

---

(١) سورەتی العلق ئایەتی (٥)

(٢) سورەتی المجادلة ئایەتی (١١)

(٣) الفوائد ابن القیم (ل ١٥١)

(٤) البناء الفكري د.فتحي حسن ملكاوي (ل ٤٨)

## حەوتەم: پەیوەندی فکر بەکردەوە و کردار

هەر کردەوەیەك مرۆڤ بیەوێت ئەنجامی بدات سەرەتا بە فکر دەست پێ دەکات و گەڵاڵەی دەکات، دواتر بەپێ بیرکردنەوەکە دەیکات بەکردار (ئیبن قەییم) یاسایەکی زێڕینی هەیە لەم بارەیەوە، دەفەرموێت : (مبدأ كل علم نظري وعمل اختياري هو الخواطر والأفكار، فإنها توجب التصورات، والتصورات تدعو إلى الإيرادات، والإيرادات تقتضي وقوع الفعل وكثرة تكراره، تعطي العادة فصلاح هذه المراتب بصلاح الخواطر والأفكار وفسادها بفسادها)[١]

واتە: (سەرتای هەموو بیردۆز و کردەوەیەکی هەڵبژێردراو، لە خەتەری دڵ و بیرکردنەوەکان دەست پێ دەکات، ئەم بیرکردنەوەیە گریمانە دروستدەکات، گریمانەیش ویست و خواست دروست دەکات، ویست و خواستیش دەخوازێت کردەوە و کار ئەنجام بدات، زۆر دووبارە بوونەوەی بیرکردنەوە نەریت و ڕەوشتت پێ دەبەخشێ، چاکسازی و دروستی ئەم پلەو پایانە بەچاکی بەهۆی چاکسازی خەتەرە و بیرکردنەوەکانە، خراپیشی بەهۆی خراپی بیرکردنەوەکانە.

گەر بەوردی سەرنج بدەین بە ئایەتەکانی قورئان و پەیوەندی نێوان ئیسلام و ئیمان و زانست و کردار، فکر پەیوەندی بەهەموویانەوە هەیە و بەشداری کاریگەری هەیە لە سەریان:




---

(١) الفوائد لابن القيم الجوزية (ل ٢٥٢ )

## هەشتەم: پەیوەندی فکر بە ئاوەدانکردنەوە (الاعمار)

لە پێشدا ئاماژەمان بەوەکرد، کە مرۆڤ چەند وەزیفەیەکی گەورەی لە ئەستۆی دایە، یەکێك لەوانە ئاوەدانکردنەوەیە:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾[1]

واتە: (ئەو بەرپای کردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە). مرۆڤ بەشێوەیەکی زۆر سروشتی حەزی لە لێکۆڵینەوە و گۆڕانکاری و داهێنانە، لێکۆڵینەوە و گۆڕانکاری و داهێنانیش سەرەتاکەی لە فکر دەست پێدەکات، ئاوەدانکردنەوە پیشەی سەرەکی مرۆڤەکانە، دوای ئەوە دێت، کە بیرکردنەوەیەکی زۆر ڕاست و دروست لە بونەوەر بکرێتەوە، بونەوەر ماناکەی چیە؟ بۆچی دروست کراوە؟ پەیوەندی بەمرۆڤەکانەوە چیە؟ لەکوێوە لیکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت؟ ئەمانە هەموو پرسیاری فکری فەلسەفین، پێویستیان بەبیرکردنەوەیەکی زۆر قوڵ هەیە، تا ئەنجام بدرێت.

ئاوەدانکردنەوەی زەوی یەکێکە لە پێویستیەکانی ژیان، هەردەبێ مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات و ڕێگاکانی بدۆزێتەوە و بەرجەستەی بکات.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾[2]

واتە (تۆ کێوەکان دەبینیت وا دەزانیت، کە وەستاون و بێ جووڵەن، لەکاتێکدا کە ئەوانیش وەکو هەور لە جووڵەدان، چونکە زەوی بەخێرایی هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، هەروەها لەسەرەتای بەرپابوونی قیامەتدا کێوەکان وەکو خوری شیکراوە دەبڕێن بەئاسماندا و چاڵوچۆڵی زەوییان

---

(١) سورەتی هود ئایەتی (٦١)

(٢) سورەتی النمل ئایەتی (٨٨)

پێ پڕدەکرێتەوە)، ئەمەیە دەستکردی ئەوخوایەی، کە هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کاروکردەوانەی، کە ئەنجامی دەدەن.

**(ئیبن عاشور)** لە (تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (ئەمە داوایەك لەئەهلی زانست و زاناکان کراوە بۆ ئەوەی ڕوو لە گەردوون و بوونەوەر بکەن، لە وردیی و دانایی وجوانی و داهێنان و دروستکردنی بکۆڵنەوە)[1].

کەواتە ئاوەدانکردنەوەی زەوی، کە پێکهاتووە لە بونیاتنان و شارستانیەت وڕۆشنبیری و ژیانی گشتیان پەیوەندی تەواویان بەلایەنی فکریوە هەیە.

بیرکردنەوە کردەیەکی بێدەنگی مێشك نیە، بەڵکو کردەیەکی تەجروبی دەربڕە، وشیارە، دۆزەرەوەیە، ڕامکراوە بۆبەرجەستەکردنی ئاوەدانی، بونەوەر گۆڕەپانی بیرکردنەوەیە بۆ بونیاتنان و داهێنان، بیرکردنەوە بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە داوایەکی قورئانیە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لە وردەکاریی و پەنهانەکانی بونەوەر بزانێ، بە زەوی و ئاسمان و چیا و دەریا و گشتی بۆ خزمەتکردنی مرۆڤە. خوای گەورە پانتایی زۆر فراوانی بۆ مرۆڤ فەراهەمکردووە، تاوەکو زەوی پێ ئاوەدان بکاتەوە وەك دەفەرموێت:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾[2]

---

(١) ابن عاشور، التحرير والتنوير (ب٢ - ل٤٨)

(٢) سورەتی الرعد ئایەتی (٢ - ٤)

واتە: (خوا ئەو زاتەیە، كە بەچاوی خۆتان دەبینن چۆن ئاسمانەكانی بەبێ كۆڵەكە و ستوون بەرزكردۆتەوە و ڕایگرتووە، لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی وەستاوە، ئەڵبەتە چۆنیەتی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایی و گەلێ شتی لەو بابەتانە لەڕادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیك پرسیووە، لە وەڵامدا وتوویەتی: وەستانەكە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەكەی شاراوەیە، پرسیاركردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕبوون پێی واجبە، خۆر و مانگیشی ڕام هێناوە، هەریەكەیان لە چەرخ و خولگەی خۆیدا بێوچان تاماوەیەكی دیاریكراو دەسوڕێنەوە، هەر ئەو زاتە كاروباری جیهان هەر هەمووی بەڕێ دەكات و ڕێكی دەخات، هەروەها ئایەتەكانی قورئان بەوردی و دوورو درێژی دەخاتە بەرچاو، بۆ ئەوەی دڵنیابن لە بەخزمەت گەیشتن و ئامادەبوونی بەردەم دادگای پەروەردگارتان بۆ لێپرسینەوە. هەر ئەو زاتەشە، كە زەوی پانوبەرین كردووە، هەرچەندە لە شێوەی گۆدایە، كەژوچیا و ڕووباری زۆری تێدا دابین كردووە، لە هەموو بەروبوومێك جووتی فەراهەم هێناوە لە هەردوو جۆرە، شەوی والێكردووە، كە ڕۆژ داپۆشێت، بەڕاستی ئالەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك بیربكەنەوە. لەسەر ڕووكاری زەوی پارچەی جۆراوجۆر هەیە لە پاڵ یەكدا، كە كاركردنیان هەیە لەسەر چۆنێتی و بەرهەمی ڕووەك، جگە لەوەی جیاوازیان نیشانەن بۆ كانزا جۆراوجۆرەكان، هەرەها باخی ڕەزی ترێ، كشتوكاڵی هەمەجۆر لە دانەوێڵە و بێستانەكاندا، دارخورمای یەك قەدو دوو قەد، هەموو ئەمانە بەیەك ئاو ئاودێر دەكرێن و لە یەك جۆر ئاو دەخۆنەوە، بەڵام سەرەنجام ئەو هەموو بەروبومە جیاوازە لە قەبارەو تام و بۆن و ڕەنگ و شێوازدا، پەیدا دەبن، هەندێكیانمان لە هەندێكی تر بۆ خۆراكی ئادەمیزاد نازدارتر و پەسەندتر كردووە، بەڕاستی ئالەو شتانەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك عەقڵ و ژیری خۆیان بخەنەكار.

## نۆیەم: پەیوەندی فکر بە ڕاپەرین و هەستانەوە: (النهضة)

(نەهزە) بەمانا فراوانەکەی لەگشت بوارەکانیدا یەکێکی ترە لە پێداویستەکانی مرۆڤ، لەزۆر لایەنەوە مرۆڤ پێویستی بەجارێکی تر هەستانەوەو (نەهزە) هەیە. وەك ڕاپەرین و نەهزەی زانستی، ئابوری، سیاسی و پەروەردەی، فێرکردن، فەرهەنگی، ژیاری، شارستانی هتد...

ئاوڕێك لە ئەوروپا بدەینەوە نوخبەی فکری سەرچاوەی شۆرش و ڕاپەرینی ئەوروپا بوون، ئەوروپا بەوەی زانی بەتایبەتی لەڕێی دبلۆماتکارەکانیان لەڕێی پاشاکانیان دەیاننادرن بۆ لای خەلیفەی مسولْمانان، هەروها لەڕێی ڕاستەوخۆی ئەندەلْوس و سەقلیە، دواتر لەئەنجامی جەنگی (صەلْیبیەکان). سەرکردەی ئەوروپیەکان وەفدیان دەنارد بۆ گواستنەوەی زانست و شارستانیەت لەوڵاتی موسڵمانان بۆلای خۆیان، قوتابیان تێدا فێردەکرد، پۆڵ پۆڵ و دەستە دەستە کەسانی فکری و زانستی لە ئەوروپا پێگەیشتن لە زانستگا و نوسراوی موسڵمانان، دروست بوونی سەرکردایەتی فکری لە چەرخی دوانزدەهەم لە ئەوروپا بەرەبەرە دروستبوون لەزۆربەی بوارەکاندا، ئەم سەرکردە فکریانە دەزگا و دامەزراوەی فکریان دامەزراند، تا کۆمەڵگای ئەوروپیان لە پاشکۆی (تەقلید) و دواکەوتووی گەیاندە پێشەنگی و سەرمەشقی! تادەگاتە ئەمرۆ هەر بەردەوامە! فکر و زانست و ژیانیان بەکارهێنا بۆ بونیاتنانەوە، دواتر هێزی سەربازیان پێ دروستکرد بۆ دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ لە ئەمریکای باکوور ئەمریکای باشوور دوای کیشوەری هیندیان پێ داگیرکرد، دواتر زۆربەی هەرە زۆری جیهانیان پێ داگیرکرد، تاگەیشتنە چەرخی بیستەم، ئێستا جیهان بەدەست نوخبە فکریەکانەوەیە چۆنیان بوێت ئاوای دەبەن.

## پێویستیمان بە سەرکردەی فکری :

سەرجەم زانستەکان زادەی بیرکردنەوە و فکری مرۆڤن، ئینجا ئەم زانستانە سەرچاوەکانیان (وەحی ) خودایی بێ، کە قورئان و سونەتە، یان جیهانی ماددیی سروشتی بێ، یان کۆمەڵایەتی و جیهانی دەروونی بێ، ئەم زانستە جاری واهەیە بەڕاستەوخۆ لە دەق و ڕووداو و شتەکان وەردەگیرێ، جاری واش هەیە لە ڕێگای بیرکردنەوەی عەقڵی و هەستەوەرەکانەوە وەردەگیرێ. بۆیە زانست لەلای مرۆڤەکان فکری مرۆڤەکانە، بەڵام ئەم فکرە ئەنجام بەدەست دەهێنێ، بەئەندازەی تێڕمان و وردەکاری و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، دوای ئەنجامدان و بەدەست هێنانی قۆناغی دووەمی بواری فکری دێت، ئەویش بەکارخستنی بەرهەمەکەیە، چۆن بەکار بخرێ بجێتە بواری جێبەجێ کردنەوە؟ کێ بەکاری بخات؟ لەکام بوارە بەکار بکرێت؟ کەی و چۆن بەکار بکرێت؟ ئەمانەش دووبارە پێویستیان بە فکر هەیە.

## ئوممەت و سەرکردەی فکری :

ئومەتی ئیسلامی هەڵگری پەیامی خودایيە، سەرمەشقی میللەتانی ترە، لە دونیا و دوارۆژ دەبێتە شاهێد بەسەر میللەتانی تر:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا ﴾[1]

واتە: (بەو شێوەیەش ئێوەمان بەگەلێکی میانەڕەو گێڕاوە لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستیەوە، لە ڕووی دنیاو قیامەتەوە، لەڕووی داخوازییەکانی ڕۆح و نەفسەوە هتد...، تابنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، تابزانن

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (١٤٣)

ئەم ئاین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێر و سەربەرزیە بۆ تاك و كۆمەڵ، لەهەموو سەردەمێكدا و لەهەموو بوارەكانی ژیاندا، بۆ ئەوەی پێغەمبەریش لەهەموو ئەو بوارانەدا، مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێت. پێغەمبەران دڵسۆزی ئومەتی خۆیان بوون لەسەر ئەوەی بەئەركی سەرشانی خۆیان هەستاون .

بێگومان سەرقافڵەی میللەتان پێویستی بە سەركردەی فكری هەیە، هەر لەزووەوە كار لەسەر دروستكردنی قیادەی فكری و دەزگای تایبەتی فكری كراوە، لە چەرخی دووەمی كۆچی، كە دەستكرا بەنوسینەوەی فەرموودەو زانستی فەرموودە. یەكەم قوتابخانە فكری بوو، پیاوانی وەك (موحەممەد كوڕی موسلم زهری، ئیبن جریج، و سوفیانی سەوری، ئەوزاعی، سەركردەی فكری بوون. لە چەرخی سێیەم (ئیمام ئەحمەد بن حەنبەل، و ئیسحاقی كوڕی راهویە، دواتر (بوخاری و موسلیم و ترمذي و نەسائی و ئیبن ماجە و ئەبوداود)، وێنەی ئەوانە سەركردەی قوتابخانەی فكری ئەم چەرخەبوون. لە بواری فیقهی ئیسلامیش فكری زۆر بەرز لەم قوتابخانەیەدا دروستبوون و پێشەوایەتی ئومەتی ئیسلامیان كردووە، وەك: (ئیمام ئەبوحەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەد بن حەنبەل، دوای ئەوان بەهەزاران سەركردەی فكریان پێگەیاند، هەر لەسەر هەمان ڕێڕەو لەبواری (تەفسیر) و (عەقیدة) و (تەصوف) و بوارەكانی تر، پێشەنگی فكری دروستبوون.

ئەم دەزگا و دامەزراوە سەرەكیانە تەنها لەبواری زانستی شەرعی كورتیان نەكردۆتەوە، بەڵكو لەبوارەكانی پزیشك و ئەندازیاری و كیمیا و فیزیا و گەردوونناسی و یاسا و دەستوریش پێشەنگی فكری بوون، (ئیبن سینا و زەینەب طبیبە و ئەبوبكری ڕازی خاوەنی كتێبی (القانون في الطب، المحاوي في الطب) لەگەڵ خوارزمی دەیانی تر لەم بوارانەدا.

## بیركردنەوە (التفكیر)

بیركردنەوە بە چەند پێناسەیەكی جیا تێپەڕیوە، لەلایەن موسڵمانان و جگەلە موسڵمانان، بەپێی قوتابخانە و بیردۆزەكان پێناسەكانیشیان بۆ بیركردنەوە جیابوە، بەتایبەتی لەلای شارەزایانی بواری فەلسەفە. خوێنەر سەرەتا پێش ئەوەی بچێتە ناوەڕۆكی بابەت پێی خۆشە مانا و واتای پێناسەی سەرە بابەتەكە بزانێ، بیركردنەوە چییە؟ لەچییەوە هاتووە؟

بیركردنەوە (التفكیر)، لە زمانی كوردی بەواتای بیركردنەوە، ڕامان، تێڕامان دێت[١]، بەڵام پێناسەی بیركردنەوە چەندین پێناسەی كراوە، لەوانە: (فەتحی جروان) دەڵێت: (التفكیر سلسلة من النشاطات العقلیة التی یقوم بها الدماغ، عندما یتعرض لمثیر معین عن طریق الحواس)[٢]

واتە: (بیركردنەوە زنجیرەیەك لە چالاكی عەقڵە، كە مێشك پێی هەڵدەستێ لەكاتی توشبوونی هاندەرێكی دیاری كراو، لە ڕێگای هەستەوەرەكانەوە.

یەكێك لە دیاریترین نوسەری كتێبی التفكیر (ئیدوارد دی بونو) دەڵێت:

(التفكر: القدرة علی اتخاذ القرار وحل المشكلات والحكم علی شيء معین)

واتە: بیركردنەوە توانا و هێزێكە توانای بڕیاردانی هەیە، گرفتەكان چارەسەر دەكات، حوكم لەسەر شتێكی دیاریكراو دەدات).

---

(١) فەرهەنگی دەریا (ب ١ - ل١٢٦ )

(٢) تعلیم التفكر- فتحی جروان (ل ٣٣)

(راغبی ئەسفەهانی ) دەڵێت: (التفكر: جولان تلك القوة بحسب نظر العقل، وذلك للإنسان دون الحيوان)[1]، واتە: بیرکردنەوە: جوڵەی ئەو هێزەیە بەپێی تێڕوانینی عەقڵ، ئەمەش تەنها بۆ مرۆڤە نەك گیاندار.

## گرنگی بیرکردنەوە (أهمية التفكير)

لەپێشدا زۆر بەفراوانی باسی فکرمان کرد، بێگومان بیرکردنەوە (تفكير) زۆر لە فکر جیاناکرێتەوە، بەتایبەتی لەلایەنی گرنگیەکانیەوە، بەڵام بەکورتی بەچەند خاڵێك ئاماژەی بۆ دەکەین:

١- ئیسلام زۆر گرنگی بەبیرکردنەوە داوە، بە بناغەی (ئیمان) و زانستی داناوە:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾[2]

واتە: بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە جیاوازی و گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیرەکان، ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بەپێوەو بەدانیشتنەوە بەڕاکشانەوە، وەبیر دەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی (ئەڵێن) ئەی پەروەردگارمان ئەمە (جیهان)ت دروستنەکردوە بەبێ هودە پاک و بێگەردی بۆتۆ دەسا تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ثُمَّ كُلِى مِن

---

(١) مفردات الفاظ القران. راغب الأصفهاني (ل٦٤٣)

(٢) سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩٠ - ١٩١)

كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًاۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[١]

واتە: پەروەردگاری تۆ ئەی ئینسان نیگاو ئیلهامی کردووە، بۆ هەنگ، کە جێگە بۆ خۆی ساز بکات لە کون و کەلێنی چیاکاندا، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش، کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکا. لەوەودوا فێرمان کردووە، کە لە هەموو بەروبووم و شیلەی گوڵان و شتی بەسوود بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە: ئەو نەخشانەی، کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچیەوە ئەنجامی بدە، لە دروستکردنی شانە و مژینی شیلە و دروستکردنی هەنگوین و پووڕەدان بەدەوری شاژندا و بەخێوکردنی گەراکان هتد...، جا لەناو سکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە، کە شیفای تیادایە بۆ زۆر نەخۆشی، خەڵکی سەرەڕای تامی شیرین و خۆشی. بەڕاستی ئا لەمەشدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە، سەرنج بدەن لە هەنگ و شانەکانی لە فڕین و هاتووچۆی، لە هەنگوین و تام و بۆن و ڕەنگی،... هتد...).

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[٢]

واتە: هەر ئەو زاتەشە، کە زەوی پان و بەرین کردووە، هەرچەندە لە شێوەی گۆدایە، کەژ و چیا و ڕووباری زۆری تێدا دابین کردووە، لە هەموو بەروبوومێك جووتی فەراهەم هێناوە لە هەردوو جۆرە، شەوی والێکردووە، کە ڕۆژ داپۆشێت، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

٢- بیرکردنەوە یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی وەدەست هێنانی ماریفەت و بەرهەمەکانی ماریفەت، ئەم سەردەمە سەردەمی ماریفەت و زانیاریە، بیرکردنەوە دەوری باڵای تێدا بینیوە.

---

(١) سورتی النحل ئایەتی (٦٨ - ٦٩)

(٢) سورەتی الرعد ئایەتی (٣)

٣- گرنگێکی زۆر دەدرێت بەلایەنی پراکتیك (التطبيقي)، زانستی تەکنەلۆژیای سەردەم دووبارە بیرکردنەوە هۆکاری سەرەکییە لە داهێنانی تەکنەلۆژیا.

٤- بیرکردنەوە هۆکارێکە بۆ دروستبوونی تاکی سەرکەوتوو لەنێو کۆمەڵگە، بۆ چارەسەری گرفتەکان و داڕشتنی بەرنامەی ژیان.

٥- لەم سەردەمەدا بیرکردنەوە بۆتە زانستێکی سەربەخۆ، زۆربەی ڕاهێنەرە نێودەوڵەتی و جیهانیەکان سەنتەری تایبەتیان کردۆتەوە بۆ ڕاهێنانی تاك لەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەرێنی.



٦- چەندین کۆنفراسی جیهانی و خۆجێی بۆ بیرکردنەوە، لەگەڵ سەدان کتێب و نوسراو، لەم بارەیەوە لەبەر گرنگی بیرکردنەوە (التفكير).

## جۆرەکانی بیرکردنەوە:

مرۆڤ لەوەتەی هاتۆتە سەر زەوی دەستی کردووە بە بیرکردنەوە، بیرکردنەوەکانیشی شێواز و جۆری جیاواز بوون، بەپێی ئاستی هۆشیاری و قۆناغ و سەردەم و ژینگە گۆڕاون، تاوەکو لە شارستانیەت و ژیانی شارەکان نزیکتر بێتەوە، بیرکردنەوەکانی وردتر و سەرکەوتوتر و بەهێزتر بووە، بەڵام ئەوەمان بیرنەچێ مرۆڤ بەتەنها بەپشت بەستن بە عەقڵی خۆی، نەی توانیوە بیرکردنەوەکانی ڕاست و دروست و تەندروست بن، بۆیە زۆرجار مرۆڤەکان توشی بیرکردنەوەی هەڵە و (خورافيات) بوینە، تا ئاستی مرۆڤی وەها نزم کردۆتە و گیاندارو دارودرەخت و بەرد و مانگ و ئەستێرەی پەرستوە، ئەویش جۆرێك بوو لە بیرکردنەوە، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە، ئەم لادان و بیرکردنەوە لارییانەی بە پەیامی خۆی ڕاستکردۆتەوە، مرۆڤەکانی خستۆتە سەر بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروست، لەگەڵ ئەوەش مرۆڤ لە ئەنجامی داهێنان و دۆزینەوەی شتە نوێیەکان جۆرەها بیرکردنەوەی بەکارهێناوە و بەرهەمی هێناوە، لەوانە: (بیرکردنەوەی کارا، لەیەك نزیك، ڕەخنەیی، بەرهەمهێن، (جوزئی)،

گشتگیر، وردبوونەوە، نوێکاری، وەرزشی، زانیاری، داهێنان، بازنەیی، بڕیاردەر، چارەسەری گرفت، (تەحلیلی)، هەستیار، زانست هتد...[١].

## چۆنیەتی ئەنجامدانی کرداری بیرکردنەوە:

زانیمان بیرکردنەوە چیە، ئێستا پێویستیم بەوە هەیە بزانین کرداری بیرکردنەوە پێویستی بەچی هەیە، تا ئەنجام بدرێت، چۆن ئەنجامی بدەین، ئایە هەموو کەسێك توانای ئەنجامدانی بیرکردنەوەی هەیە، کە خاوەن عەقلە، کاتێك یەکەم مرۆڤ، کە ئادەم (سلاوی خوای لەسەر بێ) هاتە سەرزەوی چۆن دەستی بەکرداری بیرکردنەوە کرد، بۆ ئەم مەبەستە زانایانی ئەم بوارە چوار خاڵی سەرکیان داناوە کە ئەمانەن[٢].

## یەکەم: ڕاستەیکی هەست پێکراو (الواقع المحسوس):

مرۆڤ پەی بردنی بەشێوەیەکی ئاسایی و سروشتی وە بەشتێك هەستی پێ نەکات، ناتوانێ خوێندنەوەی بۆ بکات، بەتایبەتی شتی پەنهان (الغیب)، بۆیە مەرجێك لە مەرجە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی باوەڕهێنان بڕوابوونە بە (غیب)، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ الٓمٓ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴾[٣]

واتە: چەند پیتێك لە سەرەتای هەندێ لە سوڕەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان (١٤) پیتە، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی (ئیعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان، کەلە توانای هیچ کەسدا نییە بەو پیتانە کتێبێکی

---

(١) تعليم التفكر فتحى جروان (ل ٣٤)

(٢) الفكر الاسلامي محمد محمد اسماعيل (ل ٨٥)

(٣) سورەتی البقره ئایەتی (١ - ٤)

ئاوا بێ وێنە دابنێت، بەڕادەیەك هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەو مەبەستە بێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنی تریشی تێدایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەرخوا خۆی زانایە بەنهێنی ئەو پیتانە. ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە، کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە بە (جبرەئیل) دا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە مایەی ڕێنموویی و سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان و پارێزکاران، کە ئەوانەن فەرزەکان جێبەجێ دەکەن و لە حەرام خۆیان دەپارێزن، لە ڕووی بیروباوەڕ و کردار و گوفتارەوە. ئەوانەی باوەڕ بە نەبینراوەکان دەهێنن، وەك خوا و فریشتە و ئەوانەی خوا باسی کردوون و ئێمە نایانبینین، هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزییە حەڵاڵەی پێمان بەخشیوون، دەبەخشن. لەهەمان کاتدا ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو پەیامەی، کە بۆ تۆ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) دابەزێنراوە و بەو پەیامانەش کە بۆ پێغەمبەرانی سەڵاوی خوایان لێ بێت پێش تۆ دابەزێنراوە، دڵنیاش دەبن کە ڕۆژی دوایی پێش دێت و قیامەت هەر بەرپا دەبێت.



مرۆڤ ئیمان هێنانی بەشتی بەرجەستە و هەستپێکراو ئاسانترە لە شتە پەنهان و نادیارەکان، بۆیە بیرکردنەوەش لە شتی نادیار مرۆڤ کە پەی پێ نابات ناتوانێ کرداری بیرکردنەوەی تێدا ئەنجام بدات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(لا تفكرو فـي ذات الله )

واتە: فکر لە (زاتی ) خودا مەکەنەوە، چونکە عەقڵی مرۆڤ توانای سنووردارە ناتوانێ بگاتە ئەم ئاستە، کە بیر لە زاتی خودا بکاتەوە کە چۆنە و چیە! چۆن چاوی مرۆڤ سنووردارە و ناتوانێ وێنەی هەموو دونیا ببینێ، ئەگەر وێنەی هەموو ڕووداوەکانی دونیا ببینێ ناتوانێ بژی. هەروەها بیستنی مرۆڤ سنووردارە و ناتوانێ گوێ لە هەموو دەنگەکانی دونیا بێ، ئەگەر گوێی لە هەموو دەنگەکان بێت مێشکی قبوڵی ناکات، هەروەها بۆنکردنی مرۆڤ سنووردارە و ناتوانێ بۆنی هەموو بۆنەکانی دونیا بکات، ئەگەر بۆنی هەموو

بۆنەكانی دونیا بكات ناتوانێ بژێت. بەهەمان شێوە عەقڵی مرۆڤیش ناتوانێ بگاتە ئەم توانایە بیر لە چۆنیەتی (زاتی ) خودا بكاتەوە، بەڵام پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(ولكـن تتفكروا فــي مخلـوقـات الله)

واتە: بیر لە دروستكراوەكانی خودا بكەنەوە، دروستكراوەكانی خودا، ئاسمان، زەوی، دەریا، چیا، دار، درەخت، ئاو، باڵندە، ئاسن، فۆسفات، كالیسیۆم، ئەلەمینیۆم، خواردن و خواردنەوە، هتد...، گشتیان ڕاستیەكی هەستپێكراون مرۆڤ دەتوانێ بیریان لێبكاتەوە، ئەوەی بیەوێ لێی دروستبكات و بۆ ڕۆژانەی خۆی بەكاری بهێنێ و پێداویستی خۆی پێ جێبەجێبكات.
خودای گەورە لە دەیان ئایەت یەك بەیەك ڕاستیە هەستپێكراوەكان دیاری دەكات و داوای بیركردنەوەمان لێدەكات:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾[١]

واتە: (بەڕاستی لە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانی ژیر و هۆشمەند. ئەوانەی یادی خوا دەكەن لەكاتێكدا كە بەپێوەن یان دانیشتوون، یان ڕاكشاوون (لە هیچ حاڵەتێكدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناكەن، هەمیشە بیردەكەنەوە لە دروستبوونی ئاسمانەكان و زەوی، بیردەكەنەوە لە هەموو وردەكاریەك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروستكراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروستنەكردووە، پاكی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ ).

-------------------------------
(١) سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩٠- ١٩٤)

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴾[1]

واتە: (ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیرێکیان نەکردۆتەوە، کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون، لەڕاستیدا زۆربەی خەڵکی بێ باوەڕن بە گەیشتن خزمەتی پەروەردگاریان).

## دووەم: پێنج هەستیارەکەی مرۆڤ. (بیستن، بینین، چەشتن، بۆنکردن، بەرکەوتن)



شتێکی سەلمێنراوە مرۆڤ بە پێی پێنج هەستەوەرەکەی ناتوانێ کرداری بیرکردنەوەکەی ئەنجام بدات، ئەو زانیارانەی بۆ عەقل دەگوازێتەوە و دەیبیستێ لەڕێی هەستەوەرەکانەوە بێت، چاو تا شتێك نەبینێ و وێنەی نەکێشێ ناتوانێ بیگوازرێتەوە بۆ مێشك، هەروەها بیستن تاوەکو گوێی لە بیستنی دەنگێك نەبێت ناتوانێ هەواڵ بە مێشك بدات، هەروەها تامکردن دەبێ لە ڕێی هەستی چەشتن بێ، و بۆنکردن دەبێ لە ڕێی هەستی لوتەوە بێ، بەرکەوتنیش دەبێ لەڕێی هەستەوەرەکانی پێست بێت، ئینجا بگەیێنرێتە مێشك، ئەویش دەست بەکرداری بیرکردنەوە بکات و بریاری لەسەر بدات، بۆیە خودای گەورە لە سورەتی (الاسراء ئایەتی ٣٦) دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴾[2]

واتە: ئەی ئینسان لە شتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە.

---

(١) سورەتی الروم ئایەتی (٨)

(٢) سورەتی الاسراء ئایەتی (٣٦)

﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾[1]

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: هەر خوایە، کە ئێوەی دروستکردووە و دەزگای بینین و بیستن و تێگەیشتنی پێ بەخشیون، کەچی کەمتان شوکرانە بژێر و سوپاسگوزارن) .

## سێیەم: مێشك (دەماغ)

مێشك (دەماغ) مادەیەکە لە کەللەی سەری مرۆڤ کێشەکەی (١،٤٠٠) کیلۆیەك و چوارسەد گرامە! یەك ملیار خانەی تێدایە، هەرخانەیەك بە (١٠،٠٠٠) دە هەزار خانەی تر بەستراوەتەوە، مێشك (دەماغ) جیاوازە لەگەڵ عەقڵ، مێشك (دەماغ) عەقڵ نییە، مادەیەکە لە مێشکی مرۆڤ مادەم مادەیە، کەواتە: ئەقڵ نییە، هەرشتێك مادە بێت دەتوانی شوێنەکەی دیاری بکەی شوێنی عەقڵ دیارنییە، دیارە مێشك (دەماغ) گەێنەرە بۆ عەقڵ، لەهەندێ ئایەت خوای گەورە کاری تێگەیشتن بەکاری دڵ ناو دەبات، دەفەرموێت:

أ- ﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾[2]

واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروستکردووە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان (لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێ ئاگان لە حەق).

---

(١) سورەتی الملك ئایەتی (٢٣)

(٢) سورەتی الأعراف ئایەتی (١٧٩)

ب- ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾[1]

واتە: (ئایا بۆ لە قورئان و واتاکانی ورد نابنەوە، یان لەسەر دڵەکانیان مۆری لێدراوە، بەم پێوەرە بێت دڵ عەقڵە، لەکاتێك دا وانییە کەواتە عەقڵ نییە، لەم ئایەتە بۆمان دەردەکەوێت کردەی تێگەیشتن هاوبەشە لەنێوان دڵ و عەقڵ کە دەماغیش گەێنەرە و بەشدارە لەمە).

ت- ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾[2]



واتە: (ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون بەدڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە. کوان خەڵکانی ڕابوردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ ئامانج لە ژیان چیە؟ یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون، بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا، چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە).

مێشك (دەماغ) یەکێکەلە خاڵە پێویستەکانی ئەنجامدانی کردەی بیرکردنەوە، بەهۆی گواستنەوەی زانیاری لەڕێی پێنج هەستەوەرەکەوە، دەتوانی بەکرداری بیرکردنەوە هەستێ.

## چوارەم: زانیاری پێشینە (المعلومات السابقة)

زانیاری پێشینە لەسەر شتەکان هەنگاوی تەواوکەرە، بۆ کرداری بیرکردنەوە، خودای گەورە یەکەم مرۆڤی، کە دروستکرد لەسەر زەوی کە ئادەم بوو (سڵاوی خوای لەسەر بێت). ئادەم نەیتوانی شتەکان بناسێتەوە، دیارە ناسینەوەی شت بیرلێکردنەوەیە، بۆیە خودای گەورە ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە تەنانەت

---

(١) سورەتی محمد ئایەتی (٢٤)

(٢) سورەتی الحج ئایەتی (٤٦)

فریشتەکانی خوداش، چونکە زانیاری پێشینەیان نەبووە نەیانتوانی شتەکان بناسنەوە تابیری لێبکەنەوە، ئەوەی خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾[1]

واتە: (ئینجا ئادەمی دروستکرد، ویستی توانایی و لێهاتووی بۆ فریشتەکان ڕوون بکاتەوە، ناوی هەرچی پێویستی دەوروبەر هەیە فێری کرد، لەوەودوا بە فریشتەکانی ڕانواند و پێی فەرموون: ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن، ئەگەر ڕاستدەکەن و تواناى ئاوەدانکردنەوەی زەویتان هەیە، فریشتەکان وتیان: پاکی و بێگەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە، ئێمە هیچ زانستێکمان نییە، تەنها ئەوە دەزانین، کە تۆ فێرت کردووین، بەڕاستی تۆ پەروەردگارێکی زانا و دانایت. ئەوسا خوا فەرمووی: ئەی ئادەم ئادەی تۆ ئاگاداریان بکە بە ناوەکانیان، جا کاتێك ئادەم هەواڵی ناوەکانی پێدان. خوا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن بەڕاستی من خۆم ئاگادارم بە نهێنی ئاسمانەکان و زەوی، دەشزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشارنەوە. کاتێکیش بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم سوژدەی ڕێز و بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەك سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت، کە سەرپێچی کرد و خۆی بەگەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.

ئەم زانیاریانە کە خودای گەورە فێری ئادەم ی کرد (سڵاو خوای گەورەی لەسەر بێ)، ئەویش گواستیەوە بۆ نەوەکانی، لەوانیشەوە بۆ دوای خۆیان، تا ئێستەش مرۆڤـ بیریان لێدەکاتەوە وەشتی لێ هەڵدەهێنجێ، کە بۆتە سەرچاوەی بیرلێکردنەوە، لەکۆتاییدا بەم چوار پێویستیە، کە ڕاستێیکی هەست پێکراو، هەستەوەرەکان، مێشك، زانیاری پێشیینە دەتوانرێ کرداری بیرکردنەوە بەتەندروستی ئەنجام بدەین.

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (٣١ - ٣٢)

## بیرمـــەند ( مفـــکر )



زانیمان فکر چەندە چەمك و زاراوەیەکی فراوان و پەیوەندیدارە، گرنگە، هەمەلایەنە، بەرهەمدارە، بیرکردنەوە بەبێ بیرمەند نابێت.
بۆیە دەبێ بزانین (مفکر) بیرمەند کێیە؟ ڕەوشتەکانی چین؟ تایبەتمەندەکانی چین؟ لەگەڵ خەڵك چ جیاوازیەکی هەیە؟ بەکام هەنگاو دەبێتە بیرمەند؟

## بیرمـەند کێیە؟

**– لە فەرهەنگی دەریا هاتوە:** (مفکر) واتە: بیرمەند، هۆشمەند، ڕۆشنبیری ڕێنوێن[١].

**– (عەبدولکەریم بکار) دەڵێت:** بیرمەند ئەو کەسەیە تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی هەیە، لەئەنجامی ئەم تێڕوانینە، کەموکوڕی و کێشەکانی کومەڵگا دەگوازێتەوە بۆ ئەوەی خەڵك ئەحساسیان پی بجولێ و هەستی پێ بکەن، بۆئەوەی ببێتە یەکێك لە غەمە گرنکەکانی ژیانیان، ئەمەش بەهۆی شارەزایی لە سوننەتەکانی خودای گەورە لەبونەوەر، تێڕوانینێکی گشتگیر بۆ واقیع و مێژوو ڕووداوەکان، ئەوەی دەیبین و هەستی پێ دەکات خەڵکانی تر هەستی پێ ناکەن، ئاگاداریان دەکاتەوە ڕێنوێنیان دەکات بەرەو ڕێگای سەرکوتن و سەرفرازی[٢].

---

(١) فەرهەنگی دەریا (ب٢- ل١٣١٥)

(٢) بین المفکر والمتختص.د. عبدالکریم بکار (مقاله)

**- لە (معجم المعاني)دا دەڵێت:** (مفكر أي رجل فكر وعلم يعمل عقله، ليصل الى حقائق الامور) واتە: بیرمەند پیاوێکی خاوەن فکر و زانستە، عەقڵی بەکاردەهێنێت بۆ گەیشتن بەڕاستی و دروستی کاروبارو شتەکان).

هەروەها پێناسەی بیرمەندی ئیسلامی دەکات دەڵێت: (مفكر اسلامي اي رجل فكر وعلم ليعمل عقله، ليصل الى حقائق الامور المتعلقة بالاسلام، في ضوء ما يعرف ويراد ايضاحه وفلسفته)[1]

واتە: بیرمەند پیاوی فکر و زانستە، عەقڵی بەکاردەهێنێت بۆ گەیشتن بەڕاستی و دروستی کاروبارو شتەکانە، تایبەتن بە ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی زانست و زانیاری فەلسەفەیەکی ڕوون.

**- (دکتۆر ئیبراهیم فەقێ) دەڵێت:** (المفكر: هو صانع القرار، الافكار تسبب التفكير، والتفكر يسبب التركيز، والتركيز يسبب لاحاسيس، والاحاسيس تسبب السلوك، والسلوك يسبب النتائج، والنتائج تحدد واقع حياتك)[2].

بیرمەند دروستکەری بریارە، بیرۆکەکانیش هۆکاری بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوەش هۆکاری (تەرکیز) کردنە، تەرکیزیش هۆکاری وروژاندنی هەستەوەرەکانە، هەستەوەرەکانیش هۆکاری دروستکردنی سلوکە، سلوکیش هۆکاری دەرئەنجامە، دەرئەنجامیش (واقیعی) ژیانت دیاری دەکات.

---

(١) المعجم: اللغة العربية المعاصر .

(٢) قوة التفكير د.ابراهيم الفقى (ل ٢٩٣)

## سیما و مەرج و تایبەتمەندیەکانی بیرمەندی ئیسلامی

بیرمەندان لە مێژوودا ڕۆڵی زۆر کاریگەریان بینیوە، ڕێرەوی مێژوویان گۆڕیوە، گرفت و کێشەی میللەتیان چارەسەر کردووە، لەکاتی قەیرانەکان و دەروازەی ڕزگار بوونە، بەتایبەتی بیرمەندە سەردەمیەکان، وەك (موحەممەد عەبدە) و (حەسەن بەننا) و (سەید قوتب)، و(موحەممەد قوتب) و (مالك بین نەبی) و (ڕەشید ڕەزا) و (سەعید نورسی)، و (ئەبو ئەعلای مەددودی) و (مستەفا سەباعی)، و (عەلی شەریعەتی) و(سەعید حوی)، (فەتحی یکن) و (موحەممەد غەزالی)، و (یوسف قەرزاوی) و (تەها جابر عەلوانی) و (موحەممەد عەمارە)، و (حەسەن ندوی)، چەندینی تریش. لەبەر ئەوە بیرمەند چەندین مەرجی هەیە لەوانە:

### مەرجەکانی بیرمەند

**بیرمەند بیگومان کەلەخەلکی تر جیاوازە دەبێ چەند تابەتمەندیەکی هەبێت لەخەڵکی تر جیایان دەکاتەوە لەوانە:**

أ- زانست.

ب- داهێنان.

ت- نوێکاری.

ث- دیدگا.

ج- بڕیاردان.

ح- دڵسۆزی.

خ- زانیاری.

د- ڕۆشنبیر و ژیری.

## نیشانە و تواناکانی بیرمەند

### بیرمەند هەندێک توانای تایبەتی هەیە لەوانە:

١- توانای تێگەیشتن.
٢- توانای شیکردنەوەی سنور بەدەرە.
٣- ڕاهێنانی عەقڵی.
٤- شارەزایی.
٥- توانای لێك جیاکردنەوە.
٦- توانای گەیشتن و زانیاری زۆر ورد.
٧- ڕۆشنبیری فراوان و هەمە جۆر.
٨- توانای گەیشتن بەڕاستیەکان بەکورتترین ڕێگە.
٩- توانای دانایی یاسا و ڕێسا.
١٠- هاوسەنگی.
١١- بیرکرنەوەیەکی گشتگیر.
١٢- بەخۆداچوونەوەی بەردەوام.
١٣- سوود وەرگرتن لە ڕاوبۆچوونی خەڵکی تر.
١٤- سەرسوڕمان نابێت بەهەموو بۆچونێك.
١٥- ناکەوێتە نێو سۆزو(عاتیفە).
١٦- سەرناسە.
١٧- هەڵسەنگاندنی بۆ ڕووداوەکان لە ڕاستی نزیکە.
١٨- لەدوای هەق دەگەڕێ.
١٩- موجامەلە ناکات.
٢٠- پەیوەندی بە (واقیعەوە) زۆر بەهێزە.
٢١- کرداروگرفتاری یەکە.
٢٢- ناکەوێتە ژێر کاریگەر.
٢٣- پەلە ناکات و لەسەرخۆیە.

٢٤- لە (لۆمەی لۆمەکاران) ناترسێ .
٢٥- بەدوای چارەسەر دەگەڕێ .

## تایبەتمەندیەکانی بیرمەند:

بیرمەند چەند تایبەتمەندێکی هەیە، بەتایبەتی بیرمەندەکە ڕەخنەگر و (ئیجابی) بێ لەوانە:

١- کراوەیە بەڕووی ڕووداو و نوێکاری و پێشهاتەکان .
٢- جیاوازی دەکات لە نێوان بۆچوون و ڕاستەقینە .
٣- سەرچاوەی باوەڕپێکراو بەکاردەهێنێ، ئاماژەیان پێدەکات لە نوسراوەکانی .
٤- هەڵسوکەوت لەگەڵ گرفتەکان دەکات بەشێوازێکی زانستیانە .
٥- بۆ هەندێ چەمك دەزانێ لەلای خەڵك چەند مانایەکی هەڵگرتووە و ڕاستییەکەی چۆنە، بەردەوام هەوڵی ڕاستکردنەوەی دەدات .
٦- بۆچوون و ڕاجیاوازەکان وەردەگرێ، گرنگی بە هەمووان دەدات .
٧- حەزی لە هۆشیاری و ژیری و ئاگاداری هەیە .
٨- هەر شتێك جێگەی قبوڵ نەبێ پرسیاری لێ دەکات و لێی دەکۆڵێتەوە .
٩- بەدوای هۆکاری گرفتەکاندا دەگەڕێ، بەڵگەی پێویست و (بەدیلی) لا هەیە.
١٠- باش گرفتەکان تێ دەگات و جیایان دەکاتەوە، دەیانناسێتەوە .
١١- زۆر لەسەر خۆیە لە بڕیاردان .
١٢- بابەتەکان (لۆکاڵی) و بابەتی دەگوازێتەوە، کاریگەری (زاتی) لەسەر نییە.

## ڕەوشت و سیفاتی بیرمەند

بیرمەند جیاوازی زۆرە لە گەڵ خەڵکی ئاسایی، بۆیە لەم بەشە تیشکی تەواوی دەخرێتەسەر، بە دروستکردن و ناسینەوە و سوود لێوەرگرتنی بیرمەند. بیرمەند چەند خەسڵەت و ڕەوشتێکی تایبەتی هەیە لەوانە:

### ١- زانست و زانیاری خۆشدەوێ:



ئەم ڕەوشتە دەتوانین بڵێین: لە گرنگترین ڕەوشتەکانی بیرمەندە، بەسروشتی قوتابی کاتێك کەمترین زانیاری سەرەتای بەدەست دەکەوێت زۆر دڵی خۆشە، بەتایبەتی ئەگەر نوێ و تازە بێت، بیرمەند لەوزیاتر کاتێك بیرۆکەیەك گەڵاڵە دەکات، داهێنانی فکری بەرهەم دێنێ وادەزانی گەوهەرومەرجانی دەست کەوتووە، بۆیە لە کاتی نوسینی وتارێك بۆ چارەسەری بابەتێك دەیان ڕۆژ بەدیاریەوە دادەنیشێ و دووبارەی بکاتەوە قسەی لەسەر بکات پێ ئاساییە، لەبەر گرنگی پێدانی[١].

- (ئەرستۆ ) لە پێشدا گوتوویەتی (الفلسه تتطلب شروطا لمن يعمل منها وهي: عشق لادع، وذهن بارع، وصبر مقيم، وخلو البال عن مصالح المعاش)[٢]

واتە: عەشقێکی بەهێز و سوتێنەرە، زیرەکیەکی لێهاتوو، ئارامییەکی ڕاوەستاو، هەست و دەروونی خاڵی بێ لە بەرژەوەندییەکانی ژیان.

- پرسیاریان لە (ئەنیشتاین) کرد، جارێکیان وتیان جیاوازی لە نێوان بیرمەند و کەسێکی ئاسایی چی یە؟

گوتی جیاوازیمان وەکو ئەوە وایە ئەگەر بڵێنە: کەسێکی ئاسایی هەوڵبدە دەرزییەك لەژێر ئەم کۆمەڵە پوشوپەڵاشانە هەیە بیدۆزەوە، دەست بەجێ کەسەکە

---

(١) (محاضرات من مناهج وطرق تدريس، وخصائص المفكر الناقد فيصل عبدالقادر عبدالوهاب)

(٢) الفلسفة العربية مازالت في الطور السلبي لقاء مع يوسف سلامة

هەڵوەستە دەکات و هەوڵی بۆ نادات، بەڵام من یەکسەر خۆم فڕێدەدەمە نێو پۆشوپەڵاشەکە بەدوای دەرزیەکە دەگەڕێم.

## ٢- نوێکاری خۆش دەوێ:

بیرمەند لە سەرەتاوە عەشقی خوێندن و نوسین و زانست و زانیارییە، لەگەڵ هەرنوسین و خوێندنەوە و زانیارییەك نوێکاری تێدا دێتە بەرهەم.

جێگای داخە ئەمرۆ قوتابخانە و زانکۆکانمان تاڕادەیەك بێ تاقەتی هەیە لە نوێکاری و نوسین و خوێندنەوەدا. ژیانی بیرمەندێك تەمەشا بکە لە تەمەنی سی ساڵی چەند بەسۆز و جۆشوخرۆشە بۆ وەرگرتن و داهێنانی بیری نوێ، لە تەمەنی شەست ساڵیدا زۆر زیاتر هەوڵ دەدات زانیاری نوێ و داهێنان لە بیر پەیدا بکات.

## ٣- هەست بە بەرپرسیارێتی زۆر دەکات:

وەك لە سەرەتا ئاماژەمان پێکرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:
(من لم يهتم بأمور المسلمين، فليس منهم) [١].

ئەم فەرموودەیە زۆر کاریگەری هەیە لەسەر کەسێتی بیرمەند، لەکاتی دەربڕین و قسەکردن و نوسین زۆر تەرکیز دەکات، بە رۆحی بەرپرسیارەتیەوە بڕیار دەدات، دەزانی یەك وشە لێپرسینەوەی لەسەرە، دەیان و سەدان گەنج (فەتوای) لێوەردەگرن و قسەکانی تاوتوێ دەکەن بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ [٢]

بەشێك لە گەنجان کاتێك هەڵە دەکەن تووشی لادانی فکری دەبن، بە هۆی ئەم بڕیار و بۆچوونانەیە، کە لەلایەن کەسانی بەرپرس وتراوە گەنجانی پێدا لەخشتە براوە لەسەر ڕاستە ڕێ ئیسلام دوور خراونەتەوە، یان هەر بە هیلاك چوون.

---

(١) ئیمامی تەبەرانی لە معجم الاوسط دا گیراویەتیەوە .

(٢) سورەتی ق ئایەتی (١٨)

## ٤- لە بڕیاردانی جۆرێك بێ لایەنی و سەربەخۆیە:

مرۆڤ بەسروشتی خۆی ناتوانێ بەتەنها بژی، چونكە بە سروشت كۆمەڵایەتییە، بەڵام مەبەستمان لە سەربەخۆی و بێ لایەنی بیرمەند ئەوەیە لەكاتی ڕاوبۆچوون و چارەسەری گرفتەكان كاریگەری حیزب و لایەن و عەشیرەت و هزر، و تادەگاتە لایەنی دەروونیش كاری تێ ناكات، زۆر سەربەخۆیانە بیری نوێ پێشكەش دەكات.

## ٥- بیركردنەوەكانی گشتگیرن:

یەكێك لە گرفتە گەورەكانی ئێمە لەساڵی (١٩٩١) سەرەتایی كاری ئیسلامی لە كوردستان لەبەر كەمی بیرمەند، گەورەترین گرفتمان ماوە لە نێو مزگەوتەكان، كارمان لەسەر (جوزئیات) كرد، وەك پەنجە جوڵاندن و پێدانان و وێنە هەڵواسین هتد...، دەیان (جوزئیاتی فقهی) تر، كە ئەمە باوك و كوڕ، وخوشك و برا، و (ئیمام و مەئموم)، گەنج و پیری لێكترازاندن، لەكاتێكدا دەبوو بیرمەندان لەسەر (ئوصولیات و كولیات)، و بابەتە گرنگەكان كاربكەن، بیرمەند دیراسەی كۆمەڵگا دەكات، گرفتەكان پۆلێن دەكات، لەیەك لاوە سەیری چارەسەر ناكات، تەنها بەدوای قسەكردن و ڕاوبۆچوون ناگەڕێت، لایەنی سایكۆلۆژی و ئایدۆلۆژیای نیشتیمانی و كۆمەڵایەتی و بەشەكانی تری كۆمەڵگا دیراسەت دەكات، ئینجا بڕیاری چارەسەركردنی بۆ دەدات[1].



---

(١) تكوين المفكر د. عبدالكريم بكار (ل ٢٣)

## بیرمەند چۆن بیری خۆی دەگەینێ؟

بیرمەند بەهۆی ئەوەی ئاستی زۆر بەرزە، لەگەڵ كۆمەڵگە لەبیركردنەوە جیاوازی هەیە، بۆیە چەند هەنگاوێكی پێویستە بۆ ئەوەی بیرۆكەكەی بگەینێ لەوانە:

١- سنگ فراوان و لێبوردەیە لە گەیاندن .
٢- نەرم و نیان و گونجاوە لەكاتی گەیاندن .
٣- خاوەن ئەخلاقێكی لەسەرخۆ و بەرزە لە گەیاندن .
٤- زۆرترین بەڵگە بەكاردەهێنێت لەكاتی گەیاندن .
٥- بیرۆكەكانی لەڕێی كاری دەستەیی بڵاودەكاتەوە[١].

## بیرمەند كام بابەت دەورژێنێ؟

ئەو بابەتانەی بیرمەند كاری لەسەر دەكات و دەیورژێنێ، جیاوازە لەگەڵ پسپۆڕەكانی تر، بەنمونە كەسێكی زانا، بەتایبەتی لەئێستادا، نامەی ماستەر و دكتۆرا دەنوسێ، جاری وا هەیە لەسەر یەك بەشی بچوكی زانستی، یان (فقهی)، یان كۆمەڵایەتی، یان ئابووری دەنوسێ، بەڵام بیرمەند بابەتی گشتی هەستیار دەورژێنێت، ئەو بابەتانەی پسپۆڕەكانی تر ناتوانن چارەسەری بكەن، یان زۆرجار تەنانەت هەستی پێ ناكەن. ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە بە تایبەت لەم سەد ساڵەی دوایی، ئەوانەی بابەتی هەستیاریان جوڵاندووە تائێستاش كاریگەریان ماوە، بەسەر نەچووە، دوای ڕوخاندی خیلافەتی ئیسلامیش ئەوەی بیری لە گێڕانەوەی حوكمی خودا كردووە بەتایبەتی ڕێگای بۆ دیاری كرد، (ئیمام حەسەن بەننا) بوو، ئێستاش خەڵكان لەسەر ئەم بیرۆكەیە دەڕۆن، جگە

---

(١) (بۆ ئەم خاڵانە سودم لەم نوسراوانە وەرگرتووە، (تكوین المفكر د.عبدالله حمیدالدین، خصائص المفكر الناقد، خالد بن مصطفى، مدرب مهارات الاتصال والتفكیر).

لەم چارەسەرە هیچ چارەسەرێکی تر نەدۆزراوەتەوە، کاتێك فیکرەی عەلمانیەت هاتە جیهانی ئیسلامی، بەتایبەتی تێکەڵیەك دروستبوو لەنێوان ئیسلام وەك سیستەم، لەگەڵ فکرە و سیستەمە عەلمانیەکان، بیرمەندی گەورە (سەید قوتب) بە بیرۆکەکانی لەناو (تەفسیری) (في ظلال القران)دا، ئەم گرفتە فکرییەی چارەسەر کرد، تا ئێستاش ئەوەی لە بواری فکری بگەڕێتەوە بۆ ئەم تەفسیرە جارێکی تر بەلارێی فکری ناڕوات، لەم سەردەمەدا سەدان بیرمەندی ئاوامان هەیە توانیویانە گەورەترین بابەت بوروژێنن لەگەڵ نەخشە ڕێگای چارەسەر، بۆیە بەردەوام بیرمەند ئەم بابەتانە دەورژێنێ لەوانە:

١- گێڕانەوەی حوکمی خودا .
٢- بابەتی جێنشینایەتی مرۆڤ .
٣- مرۆڤایەتی، هەق و ماف .
٤- دروستکردنی بینای کۆمەڵگە لەسەر بیروباوەڕ (مەبدأ) .
٥- دروستکردنی بینای تاك لەسەر بیرو ڕا .
٦- دروستکردنی بینای دەوڵەت لەسەر سیستەم .
٧- ئازادی نیشتمانی .
٨- ڕەهەندە پەروەردەییەکان .
٩- شوناس و پاراستنی شوناس .
١٠- ورژاندنی چۆنیەتی ڕووبەڕووبونەوەی بیرۆکە ترسناکەکان، بەتایبەتی بیرۆکەی هاوردە .

## ( المبدأ ) بیروباوڕ، بنەما، یاسا، شوێنی دەست پێکردن:

ئەم چەمکە بەچەندین واتا دێت وەك بیروباوڕ، بنەما، یاسا، شوێنی دەست پێکردن، بەڵام (مەبدأ) لەئێستادا لە بەکارهێناندا زۆر جیاوازە. زانایان دەڵێن: (المبدأ) واتە: (هو الفکر الاساسي تبني علیه الافکار)[١]

واتە: (مەبدەئی) : بیرۆکەیەکی بنچینەییە، فکرەکانی تری لەسەر بینا دەکرێت). بەم پێیەوە (مبدأ) واتایەکی تەواو جیاوازی هەیە، لەگەڵ لایەنی زمانەوانی، لێرەدا وەك قوتابخانەیەکی فکری دیاریکراوە، قوتابخانەی فکریش سیستەمی ژیانە، خوایی بێت، یان مرۆڤی، ئێستا قوتابخانە دەستکردەکان وەك: سەرمایەداری، سۆشیالستی، لیبراری، عەلمانی، بونەتە (مەبدەئی)، کار بۆ ئەوە دەکەن ببن بە بەدیلی ئیسلام، سیستەمی ژیان دابڕێژن.

### مانای دووەمی (المبدأ)

گوتمان (المبدأ) بەچەند واتایەك دێت، یەکێك لەوانە بەواتای (من این بدأ العالم) دونیا لە کوێ و کەی دەستی پێکردووە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان . چونکە قورئان سەرەتای بوونەوەرمان بۆ دیاری دەکات، پێش بونەوەریش لە (ئەزەلەوە) خودا هەبوە پێش ئاسمان و زەوی و مرۆڤەکانیش.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾[٢]

--------------------------------

(١) ایقاظ الفکر (ل ٢١)

(٢) سورەتی الحدید ئایەتی (٣)

واتە: (ئەو خوایە یەکەمینە و لەسەرەتاوە هەر هەبووە و کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت، بەڵام ئەو هەر دەمێنێت، هەروەها ئەو زاتە دیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لەهەمان کاتدا زاتی خودا نادیارە و بەچاوی سەر نابینرێت، بەڵام بەبینایی بیر و هۆش و دڵ و دەروون ئاشکرایە، هەر خۆیشی زانایە بەهەموو شتێك).

- ئەوەی لەم بونەوەرەیە هەست پێکراو و هەست پێنەکراو، گشتی خودای پەروەردگار دروستی کردووە:

﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾[١]

واتە: (بێگومان پەروەردگارتان (الله)یە، کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە، لەماوەی شەش ڕۆژدا مەگەر هەر خۆیشی بزانێت ئەو ڕۆژانە ماوەیان چەندە، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستا، هەڵبەتە چۆنیەتی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گەلێ شتی لەو بابەتانە، لەڕادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیك و ئەحمەد پرسیووە، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕبوون پێی واجبە، بەشەو، ڕۆژ دادەپۆشێت؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەوداڵە بەدوایدا، خۆر و مانگ و ئەستێرەکان هەر هەموویان بەفەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕ و لە فەرمانی دەرناچن، ئاگاداربن و بزانن و تێفکرن کە: هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین، موبارەك و پیرۆز و گەورەیە، زاتی (الله) پەروەردگاری جیهانیانە).

---

(١) سورەتی الاعراف ئایەتی (٥٤)

- هەرچی لە بونەوەرەوە جوڵاو و جێگر، دیار و پەنهان، گەورە و بچوك، ورد و درشت، گەردوون، هیچ بوونی نەبوو، کە خودا هەبوو.

- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(کان الله ولم یکن شئ قبله، وکان عرشه علی الماء، ثم خلق السموات والارض)[١]

واتە: (خودای گەورە هەر لە (ئەزەلەوە) هەبووە، لە پێش ئەو هیچ شتێك نەبووە، عەرشی خودا لەسەر ئاو بوو، ئینجا ئاسمان و زەوی دروستکرد).

- هەروەها دەفەرموێت:

(اللهم انت الاول، لا شیئ قبلك، وانت الاخر لا شیئ بعدك)[٢]

واتە: (خودای گەورە تۆ هەر یەکەم و لەسەرەتاوە هەبووی و هیچ شتێك پێشی تو نەبووە، تۆ کۆتایی و هیچ کەسێك دوای تۆ نییە).

- جیهان پێکهاتووە لە مروڤ، دروستکراوەکان، ئاسمان، زەوی، هتد...، هەمووی هەر لە سەرەتا خوای گەورە دروستیکردووە، وەك لەبارەی دروستکردنی مرۆڤەکانەوە هەر لەسەرەتاوە دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ ﴾[٣]

واتە: (ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوە چاك

---

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە، (ب٦ - ل ٢٦٩٩ - کتاب بدء الخلق)

(٢) مسلم گێڕاویەتیەوە (٢٧٣١)

(٣) سورەتی الحج ئایەتی (٥)

بزانن، كە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستكردووە، لەوەودوا نەوەكان لە نوتفەیەك پەیدابوون، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆ هەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەكی تەواو و سەر و سیمادار، یان ناتەواو، هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان، تا بۆتان ڕوونبكەینەوە، كە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروستكردووە و دووبارە دروستكردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەكاندا جێگیری دەكەین، تا كاتێكی دیاریكراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووكی دەرتاندەهێنین لە سكی دایكتان، دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێز و تواناتان، هەتانە دەمرێنرێت بەگەنجی، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەڕپووتترینی تەمەنەكان، بۆ ئەوەی هیچ شتێك نەزانێت دوای ئەوەی جاران دەیزانی.

لە بارەی ئاسمان و زەویەوە دەفەرموێت:

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾[1]

واتە: بەدیهێنەر و دروستكاری ئاسمانەكان و زەوییە، هەر كاتێك بڕیاریدا و فەرمانێكی دەركرد، دەفەرمووێ ببە، دەبێ.

- لەبارەی دروستبوونی هەموو بونەوەر بەگشتی دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾[2]

واتە (خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە).

## تیۆر و بیردۆز و (مەبدەئەكانی) سەردەم

دوای ئەوەی باسی (مەبدەئ)مان كرد، پێویست لێرەدا پێناسە و ژیان و ئامانجی هەندێك لەم قوتابخانە فكریانە باس بكەم، كە لەلای بەشێك لە گەنجەكانمان بونەتە (مەبدەئ)، وەكو سیستمی ژیان مامەڵەیان لەگەڵ

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (١١٧).

(٢) سورەتی الزمر ئایەتی (٦٢).

دەکرێت، هەریەك لەم قوتابخانە و بیردۆزانە، بونەتە (مەبدەئ) لەسەردەمی ئێستاماندا، لەگەڵ ئەوەی هیچ یەك لەوانە دان بەوەی تردا نانێت و لەگەڵ زانست و (فیترەت) و لۆژیك دژە! بەڵام تائێستاش جۆرێك برەویان پێ دەدرێت و وەك مەبدەئێکی فکری مەمەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بەشێك لەم قوتابخانانە لەناو حیزبەکانی کوردستان کاریان پێ دەکرێت، بەشێوازێکی ورد بەرنامەڕێژی بۆ دەکرێت، بێ ئەوەی کۆمەڵگە ئاگاداری بێت. لەڕووی فکریەوە پەیوەندی بەهێزی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەیە، بۆیە تیشکێکی خێرا دەخەینە سەریان.



**یەکەم:** چارڵس داروین و بیردۆزی پەرەسەندن (تطور).

**دووەم:** سیگموند فرۆید، بیردۆزکەی، زانستی دەروونناسی سێکسی.

**سێیەم:** ئیمیل دورکایم: بیردۆزی، زانستی کۆمەڵناسی.

**چوارەم:** جۆن پۆل سارتر، بیردۆزی، فەلسەفەی (وجودي).

**پێنجەم:** ماکیاڤیلی بیردۆزی (مەبدەئی) (الغاية تبرر الوسيلة).

**شەشەم:** کارل مارکس، بیردوزی ئابوری و دروشمی (لا اله والحياة مادة).

## یەکەم: داروین و بیردۆزی پەرەسەندن (تطور)

**داروین کێیە:** چارلس داروین کەسێکی جولەکەیە و لە ساڵی (١٨٠٩) لە ئینگلتەرا لەدایك بووە، سەرەتا بە خوێندنی پزیشکی دەستی پێکردووە، دواتر تەواوی نەکردووە و گواستراوەتەوە بۆ بەشی لاهوت، لەوێوە دەستی کردووە بە گەڕان و گەشتی زانستی بۆ دۆزینەوەی شتە پەنهانەکانی ناو دەریا، دوای جیهانی زیندەوەرزانی، تا چارەگە سەدەیەك، دواتر بیردۆزی پەرەسەندنی لەلا گەڵاڵە بوو، پەرتوکێکی دانا بەناوی (اصل الانواع)، ئەم پەڕتوکە دەنگۆیەکی گەورەی لە ڕۆژئاوا دروستکرد، هەندێك فکرەی نوێ تێدا بوو، لەگەڵ فکرەی ئەوکات جیاواز بوو، دواتر پەرتوکێکی تری نوسی (اصل الانسان)، باسی پەرەسندنی مرۆڤی تێدا بوو، لە ساڵی (١٨٨٢) کۆچی دوای کردووە.

## پوختەی بیردۆزی پەرەسەندنی داروین

١- بیردۆزی پەرەسەندنی داروین پێی وایە، زیندەوەرە زیندووەکان بەگشتی بەپێی پەرەسندنێکی پەیژەیی، لە نزمترین پلە و بۆ بەرزترین پلە سەردەکەون، مرۆڤ لە لوتکەی پەرەسەندن دایە.

٢- مانەوەی هەندێك جۆر و لە ناوچوونی هەندێك جۆری تر، دەگەڕێتەوە بۆ ململانێ لەپێناو مانەوەدا، مانەوەش بۆ باشترینیانە.

٣- ئەم ئەندامەی لاشە هیچ کاریگەری نییە، بەرەبەرە بێ هێز و لاواز دەبێت، تاکاریگەری نامێنێت.

بیردۆزی داروین لە جیهانی زیندەوەر بەم جۆرە بوو، دوایی گشتاندیان بەسەر جیهانی مادیش، کە ئەستێرە و هەسارە و دارودرەخت و گیانلەبەریشی گرتۆتەوە، دوای پەرەسەندنی (التطور) بووە مەزهەبی خوانەناس و بێ باوەڕەکان، ئەوان قۆستیانەوە و کردیانە بنەما و هەوڵی ئەوەیاندا لەبواری زانستی برەوی پێ بدەن. لۆبیە سەهیۆنیە جیهانیەکان برەویان پێدا لەبازاڕی جیهانی و بواری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن بەشێوازێکی زۆر[١].

---

(١) كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصر. عبدالرحمن حسن حبنكه الميداني (ل ٣١٧)

## دووەم: فرۆید، بیردۆزکەی، زانستی دەروونناسی

**فرۆید کێیە:** سیگموند فرۆید یەهودیە، لەدایك و باوکێکی یەهودی لە نەمسا لەدایك بووە، دامەزرێنەری دەزگای شیکاری دەروونیە، هەوڵیدا بۆچوونەکانی خۆی لە (تەفسیر) کردنی گەشەی کۆمەڵگە جێبەجێ بکات، لەگەڵ ئایین و شارستانیەت و پەرەسەندن. چەندین پەرتوکی هەیە لەوانە:

١- تفسير الاحلام.
٢- نظرية الجنس.
٣- مدخل الى التحليل النفسي.
٤- ما فوق مبدا اللذة.
٥- مقدمة في تحليل النفس.
٦- حيات.
٧- التحليل النفسي.
٨- الذات والفرائذ.
٩- معالم التحليل النفسي.
١٠- القلق.

## دەرهاوێشتەکانی بیردۆزی فرۆید:

لەگەڵ ئەوەی فرۆید لە بواری شیکاری دەروونی خزمەتێکی کرد، بەڵام دوو دەرهاوێشتەی زۆر ترسناکی جێهێشت.

١- (ئیلحاد) بەرامبەر خودا و (ئینکاری غەیبیات)، بەو پێیەی لای ئەوان مرۆڤ دیاردەیەکی مادەیە و بەس، با فکر و دەروون ژیانیشی تێدا بێت.

٢- بانگەشەی (ئیباحەی جنسی): مرۆڤ دەتوانی (مومارەسەی جنسی) خۆی بکات بەبێ سنور بەئازادیەکی ڕەها، هیچ بەربەستێکی ئایین و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و کەلتوری نابێ ڕێگر بێت.

٣- هەموو پاڵنەرەکانی مرۆڤـ (جنسە): لەدایکبوونی تامردن، بەڵکو ژیانی مرۆڤ تەنها ئەم پاڵنەرەی هەیە.

٤- ڕێگرتن لە (جنس) بەناوی ئایین، کەلتوری کۆمەڵگە، یاسا، خێزان. مرۆڤـ توشی هیستریا دەکات، توشی نەخۆشی دەروونی دەبێت.
٥- هەموو منداڵێك نێرینەی توشی گرێی (أودیب) دەبێت.

هەر لە منداڵیەوە واتە: مەیلی بۆ ئەوە دەچێت، (جنسی) لەگەڵ دایکیدا ئەنجام بدات. کچیش توشی نەخۆشی (أليكترا) دەبێت، واتە مەیلی بۆ ئەوە دەچێت کاری جنسی لەگەڵ باوکیدا بکات[١].



## سێیەم: ئیمیل دۆرکایم: بیردۆزی، زانستی کۆمەڵناسی

**دورکایم کێیە:** ناوی ئیمیل دورکایمە. یەهودیە لە فەرەنسا لەساڵی ١٨٥٨ م لە دایك بووە. پسپۆڕ بووە لە زانستی کۆمەڵناسی، بە ڕائیدی ئەم زانستە ژمێردراوە، لەدوای (ئۆگست کۆنت).

دورکایم فەلسەفەی (العقل الجمعي)، بۆ کۆمەڵگای هەڵبژارد لە بڕی دین و ئەخلاق، چەندان نوسراوی هەیە لەوانە: (تقسيم العمل في المجتمع)، (قواعد المنهاج الاجتماعي)، (الانتحار)، (الاشكال) (التربية الاجتماع) لە ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوای کردوە[٢].

١- (ئۆگەست کۆنت) فەیلەسوفێکی فەڕەنسی بوو، لە ساڵی ١٧٩٨ لە دایك بووە، دامەزرێنەری فەلسەفەیی دەستکردە، کە میتافیزێك ڕەتدەکاتەوە، پشت تەنها بە زانستی نوێی سروشت دەبەستێ، پێ وایە هەموو زانستەکانی تر لە گەردووناسی و فیزیا و کیمیا لە خزمەتی زانستی کۆمەڵناسین. لەسالی ١٨٥٨، کۆچی دوایی کردووە.

---

(١) هەمان سەرچاوە (ل ٢٩٦)

(٢) مذاهب فكرية معاصرة محمد قطب (ل ١٢٥)

٢- پێناسەی (الفعل الجمعي) لەلای دورکایم: (إنه شيء موجود خارج عقول الافراد، وهو ليس مجموع عقولهم). واتە: (عەقڵ جەمعی شتێکە لە دەرەوی عەقڵی تاکەکان، هەروەها عەقڵی کۆمەڵێکشیان نییە، مەرج نییە موافقی عەقڵی یەکێکیان بێت).

## پاڵنەرە سەرەکییەکان لە بۆچوونی دورکایم

دۆرکایم لە زانستی کۆمەڵناسی چەند ئامانجێکی هەبوو، ویستی لەم ڕێیەوە لە ژێر زانستی کۆمەڵناسی لەناو کۆمەڵگەدا بڵاوی بکاتەوە لەوانە:

١- فەلسەفەی (عەقڵی جەمعی) دانا، گومانی وابوو، کە عەقڵی دەستە (جەمعی) لە کۆمەڵگەدا دەبێ ئاراستەی تاك بکرێت، تا بیر و هزر و فکر و دابونەریت تاکی لەسەر بینا بکرێت. ئەمەش بووە هەڵوەشانەوەی ئایین و ئەخلاق لە ناو کۆمەڵگا.

٢- وای گومان دەبرد کەوا ڕەهەندی فکری و زانستیش لە دایك بووی ژیانی دەستە (جەمعی) و عەقڵی دەستە (جەمعیة).

٣- تەفسیری دیاریدەی کۆمەڵایەتی بە مادە تەفسیر کرد و دانی نەنا بە خودا و بە پەنهانەکان (الغيبيات).

٤- عەقڵی دەستەجەمعی شتێکە کاریگەری لەسەر هەموو تاکەکان دەکات، بە بەردەوام لە گۆڕان دایە، هیچ پێوەرو مەرجێکی دیاری کراو نیە، کەواتە ئەوڕۆ حەڕامی دەکات، بەیانی حەڵاڵ، دوبەیانی پیچەوانە!!! نە گۆڕی لە ئاین و ئەخلاق و قیەم دانیە، بەڵکو گشتیان دەگۆڕێت و بە دەسەڵاتی عەقڵی کۆمەڵە (العقل الجمعي).

٥- بە فەلسەفەی (عەقڵی جەمعی) دۆرکایم ئازادی تاکی لە خەڵك دادەڕنێ. هەڵسوکەوتی تاکەکان هەڵسوکەوتێکی بە زۆر سەپێندراو دەبێت. هیچ هێز و بڕیاڕ و هەڵبژاردەیەك بەدەستی خۆی نییە، هەمووی لەژێر دەسەڵاتی (عەقڵی جمعی یە).

٦- هەوڵدان لەسەر ڕەتکردنەوەی (فیترەتی) مرۆڤ، بەتایبەتی باوەڕهێنان بە خودا، بەندایەتی کردن، ئەخلاقی بەرزی، لێك هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

٧- تەفسیرکردنی ئاین و ئەخلاق لەناو کۆمەڵگە، تەنها هۆکاری کۆمەلایەتین هیچ پشتگیریەکی عەقڵی و زانستی و فکری نیە[1].

## چوارەم: جۆن پۆل سارتر بیردۆزی فەلسەفەی وجودی



**سارتر کێیە؟** ناوی (جۆن پۆل سارتر)ـە، یەهودیە و لە فەڕەنسا لەساڵی (١٩٠٥) لە دایك بووە، فەیلەسوف و ئەدیبێکی چەرخی بیستەمە، ناوی بەرامبەر فەلسەفەی (وجودی) (ئیلحادی) سەردەم ناو دەبردرێت، سەرەتا گۆڤارێکی دەرکرد بەناوی (العصور الحدیث) چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەدەب و سیاسەت کرد، وشەی (وجودی) بەکارهێنا، بووبە خاوەنی فەلسەفەی (وجودی)، بەشداری کرد لە خۆپێشاندانی یەهودی لە فەڕەنسا لە شەستەکان، بۆ پرۆسەی بەخشین بە ئیسرائیل، دروشمی (ادفع فرنکا فرنسیا تقتل عربیا (اي مسلما)). واتە: فڕەنکێکی فەرەنسی بدە، موسڵمانێکی پێ بکوژە. لە ساڵی (١٩٧٩) لە پاریس کۆچی دوای کرد. چەند نوسراو و شانۆ و ئەدەبی هەیە، لەوانە:

١- الکینونه والعدم.

٢- الفنیات.

٣- سبل الحرية.

٤- مسرحية الفاضلة.

٥- مسرحية موتي بلا دفن.

٦- مسرحية الذباب.

٧- مسرحية الايدی القذرة.

---

(١) کواشف الزیون (ل ٣٤)

## (وجـودی) چـی یە؟

(وجودی) فەلسەفەیەکی خودیە (ذاتیە)، خۆی وا پێناسە دەکات کە لە خودی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، پشت نابەستێت بە ئایین و قیەم و ئەخلاق و تەنانەت ماددەش، بەڵکو بانگشەی ئازادی ڕەها و ویست و ڕەغبەتەکانی مرۆڤ دەکات. پێناسەی (وجودی): (وجودی) بە چەند پێناسەیەکی لێك نزیك لە واتا پێناسەکراوە، لێرەدا دەمانەوێ پێناسەی (وجودی) بکەین لەلای (سارتر)، لە (موسوعة المسرة)دا دەڵێت: (الوجودية: تيار فلسفي يعلي من قيمة الانسان، ويؤكد على تفرده وانه صاحب تفكر، وحرية وارادة و اختيار ولا يحتاج الي موجه)[١].

واتە: (وجودیەت ڕەوتێکی فەلسەفیە بەرزترە لەنرخی مرۆڤ، تەئکید لەسەر تەنیا بوونی مرۆڤ دەکاتەوە، بەخاوەن فکر و ئیرادە و سەرپشکی دەزانێ، هەروەها دەڵێت مرۆڤ پێویستی بە ئاراستەکردن نییە).

## بۆچوون و بیروڕای (وجودیەت)

**فەلسەفەی (وجودی) لەسەر چەند فکرێکی بێ بنەما و دژ بەیەک دارێژراوە لەوانە:**

١- (ئیلحاد): بڕوانەبوون بە خوداو ڕۆژی دوایی، لە بۆچوونەکانی فکری وجودیە، پێیان وایە ئایین ڕێگرە لەپێش مرۆڤەکان بۆ بەرەو پێشچوون و ڕێگای ڕاست، بۆیە (مەبدەئی) لەلای (وجودیەکان) (ئیلحادە). (سارتر) پێی وایە مرۆڤ بەخۆی خودایە.

٢- بانگەشە بۆ تەنیا بوون و گۆشەگیری لە کۆمەڵگا.

٣- هەڵوەشاندنەوە و ڕەتکردنەوەی خێر و شەڕ، شتێك نییە لەلای ئەوان جێگیربێت،

---

(١) الموسوعة المسيرة (ل ٥٤٣)

هەموو مرۆڤێك چی پێخۆشە با بیكات، هەست و ویژدانی مرۆڤ جڵەوی لە دەست هەوا و هەوەسی کەسەکانە، هەر ئەو خێر و شەڕ، ڕاست و ناڕاست دیاری دەکات.

٤- بانگەشە بۆ ئازادییەکی ڕەها و بێ سنور، مرۆڤ دەبێت ڕابردووی فڕێبدات و هەموو بەربەستەکان بشکێنێ، ئایینی بێت یان کۆمەڵایەتی، یان فەلسەفی، یان لۆژیکی. دەڵێن: بەڕاستی (وجودیە) گوێڕایەڵی دەروونە.

٥- بڕوایان وایە مرۆڤ لەپێش هەموو دروستکراوەکانی ترە.

٦- بڕوایان وایە ئایینەکان کێشەی مرۆڤایەتی چارەسەر ناکەن، چارەسەر تەنها (وجودیەتە)[١].

## پێنجەم: ماکیاڤیلی بیردۆزی (مەبدەئی) (الغاية تبرر الوسيلة)

**ماکیاڤیلی کێ یە؟** ناوی نیکۆلۆ ماکیاڤیلی یە، لەساڵی ١٤٦٩ لە ئیتاڵیا دایکبووە، یەکەم سیاسەتمەداری ئەوروپایە بە کتێبی (میر) بەناوبانگە، لەم کتێبەدا بە ئاشکرا بانگەشەی جیاکردنەوەی لە ژین و سیاسەت و ئەخلاق دەکات. (مەبدەئی) ( الغاية تبرر الوسيلة)ی دانەوە.

پەرتوکەکانی: ١- الامير ٢- المصارحات ٣- فن الحرب .

بۆچوونی (مەبدەئەکانی) ماکیاڤیلی قوتابخانەی ماکیاڤیلی بووە بە سەرچاوەیەك بۆ زۆربەی سیاسیەکانی سەردەم! بەتایبەتی هەڵگرانی فکری عەلمانی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، بە بەرزکردنەوەی دروشمی (الغاية تبرر الوسيلة)، کە سیاسەتمەدار پەیوەست ناکات، بەهیچ بنەما و پەیڕەو و (قەیدێك)ی ئایینی یان ئەخلاقی یان کۆمەڵایەتی، گرنگ ئەوەیە بگەیتە دەسەڵات، چۆن

---

(١) المذاهب المعاصرة وموقف الاسلام منها (ل ٢١١)، الموسوعه الميسرة (ل ٥٤٣)، الموسوعة في المذاهب والاديان (ل ١١٧) ، رسائل في الاديان محمد بن ابراهيم الحمد (ب١ - ل ٢١٧) .

دەگەیت، بە چ ڕێگایەك، بە کام هۆکار، بەکاری دەهێنی! بیردۆز و تیۆری ئەم قوتابخانەیەش لەگەڵ بۆ چوونەکانی لەم چەند خاڵە دەخەینەڕوو:

١- بڕوابوون بەوەی کە مرۆڤ بەسروشتی خۆی ناڕوا و شەڕانگێزە، ئەگەر خێریشی هەبێ بۆ مەبەستێکە دروستی دەکات، تا بگاتە ئامانج.

٢- جیاکردنەوەیەکی تەواو لەنێوان سیاسەت و ئایین و ئەخلاق .

٣- بنەمای (الغایة تبرر الوسیلة)، لەجیاتی یاسا و ئایین و ئەخلاقیەکان .

٤- ماکیاڤیلی پێوایە دەوڵەت ئامانجە، لە (زاتی) خۆیدا گەیشتن بە جڵەوی دەسەڵات مەبەستی سەرەکییە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەست، هیچ ڕێگریەك لەبەردەمدا نییە، ئایین، ئەخلاق، (قیەم)، کلتور.

٥- ماکیاڤیلی بڕوای وایە هیچ حاکمێك لە دونیادا خاوەنی ئەخلاق و عەدالەت و قیەم نییە، ئەگەر (حاکم) پەیوەست بێت بە ئەخلاق ئەوە لەناو دەچێت، بۆیە دەبێت وەکو گورگی فێڵباز بێت و وەکو شێریش لێدەر بێت[1].

## شەشەم : مارکس بیردۆزی بۆ چونەکانی ( لا اله والحیاة مادة )

**مارکس کێیە؟** ناوی (کارڵ مارکس)ـە، کەسێکی یەهودیە، لەساڵی (١٨١٨) لە ئەڵمانیا لەدایك بووە، دامەزرێنەری فکری شوعیەتە بەناوی (الاشتراکیە العلمیە)، شیوعیەت مەزهەبێکی ئابووری کۆمەڵایەتیە، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ (ئەنجلز) هەبووە، دامەزراوە لەسەر بیروباوەڕێکی فکری، لە ساڵی (١٨٨٣) کۆچی دوایی کردووە.

---

(١) موسوعة الرد على المذهب الفكرية المعاصرة - على بن نايف الشحود (ب١ - ل ٢٩)

## دروشمەکانی مارکس:

ئەم قوتابخانەیە لەسەر بنەمای فکری فەلسەفەیی دامەزراوە، بەناوی (المادیة الجدلیة)، دوو وتەی زۆر ترسناکی هەیە!

١- (لا اله والحیاة مادة)، واتە: (هیچ خودایەك نییە و ژیانیش پێکهاتووە لە مادە).

٢- (الدین أفیون الشعوب)، واتە: (ئایین تلیاکی گەلانە).

## پەرتوکەکانی مارکس

مارکس دانایی زۆری هەبوو بە تایبەتی لە بواری ئابووری، کتێبێکی دانا بەناوی (رأس المال)، بووبە دەستوور و سەرچاوەی سەرەکی بۆ سیاسەتمەدارانی شیوعی. لەم پەرتوکەدا چەند دەستەواژەیەکی ئابووری بەهێزی باسکرد دەربارەی ماڵ و سامان، هەروەها باسی گۆڕینی کۆمەڵگەی کرد، بەتایبەت ئەم چەمکانەی زۆر بە وردی باس کرد. (بورجوازی، سەرمایەدار، پرۆلیتار، دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری، مادەی (جەدەلی)، تەفسیری مادە بۆ مێژوو، ململانێی چینایەتی، دژایەتیکردنی موڵکایەتی کەسی، دەرەبەگایەتی، هەروەها پەرتووکی (المسألة الیهودیة)شی نووسی[١].

## پێناسەی شوعیەت:

شیوعیەت چەند پێناسەیەکی جیاوازی هەیە، یەك لەوانە لە کتێبی (الادیان المذاهب المعاصرة)دا دەڵێت: (هي حرکة فکریة، واقتصادیة، إباحیة، وضعها کارل مارکس، تقوم علی الالحاد، والغاء الملکیة والفردیة، والغاء التراث واشراك الناس کلهم في الانتاج علی حد سواء)[٢]، واتە: (شوعیەت: بزوتنەوەیەکی

---

(١) المذاهب الفکریة المعاصرة و دورها في المجتمات وموقف المسلم منها (ب - ل١٠٧٨)

(٢) الادیان والمذاهب المعاصرة د.ناصر العقل و د. ناصر القفاري (ل ٩٢)، رسائل في الادیان (ب١ - ل٢٣٩)

فکری ئابووری یەهودی ئیباحیە، کارل مارکس دایناوە لەسەر بنەمای بێ باوەڕی، خاوەندارێتی تاکەکەسی ڕەتدەکاتەوە، کلتوریش ڕەتدەکاتەوە، هەموو خەڵك بەشدارە لە موڵکی گشتی بەبێ جیاوازی).

## قۆناغەکانی دابەشبونی مرۆڤەکان بە درێژای مێژوو لە لای (مارکس)

(مارکس) برەوی بە بیردۆزی تیۆری داروینی داوە (لەگەڵ ئابووری مادی تێکەڵی کرد لەسەر ئەم (مەبدەئە) مادیە تەفسیری ژیانی مرۆڤایەتی کرد، مرۆڤی کورتکردەوە لە مادە و گەشەی مادی یاسای مادەگەری لەسەر جیهانی مرۆڤەکان جێبەجێکرد، لە ڕووی بیروباوەڕەوە هەست و سلوکیان بوو، ئینجا ژیانی مرۆڤایەتی بەپێی ئەم تێڕوانین و تەصەوڕانە، دابەشکرد بۆ پێنج قۆناغی (حەتمی) لەوانە:

**قوناغی یەکەم:** شیوعیەتی سەرەتا (الشیوعیە الاولی)

**قۆناغی دووەم:** بەندایەتی (الرق) (العبودیة)، لەم قۆناغەدا بەندایەتی پەیدابوو.

**قۆناغی سێیەم:** دەرەبەگایەتی (الإقطاع)، لەم قۆناغەدا دەرەبەگایەتی پەیدابوو.

**قۆناغی چوارەم:** سەرمایەداری (الرأسمالیة) لەم قۆناغەدا سەرمایەداری پەیدابوو.

**قۆناغی پێنجەم:** (الشیوعیة الثانیة والاخیرة)[1].

ئەم گواستنەوەیە لە قۆناغێکەوە بۆ قوناغێکی تر هۆکارەکەی دۆزینەوەی بەردوامی بوارە مادیەکان بوو، شیوعیەت سەرەتا گوزەرکردنی ژیانی سەرەتایی مرۆڤەکان بووە لە دەشتودەر. ئەم قۆناغە بە قۆناغی خاوەندارێتی تاك وەسف دەکرێت. دواتر مرۆڤ کشتوکاڵی دۆزیەوە، ئەمەش بە قۆناغی ئابووری نوێ دادەنرێت، لەڕووە مادییەکەوە هۆزە بەهێزەکان بێ هێزەکانیان بەکاردەهێنا بۆیە بەندایەتی و خاوەندارێتی تاك سەری هەڵدا، لەقۆناغێکی تر مرۆڤ گاسن و هەوجاری دۆزیەوە، ئەم قۆناغەش بە قۆناغێکی تری مادی نوێ دادەنرا،

---

(١) تطور المجتمع عبر التأریخ سیفال، العلمانیة نشأنها و تطورها (ب١- ل٢٤٩)

چونکە بەم ئامرازە کشتوکاڵیانە زۆرترین زەوی پێ دەکێڵرا و بەرهەم زیاتر بەدەست دەهات. بۆیە دەرەبەگایەتی سەری هەڵدا. بەمەش سیستەم و بیروباوەڕەکان تەواو لەگەڵ پێشو جیاواز بون و گۆڕان. لە قۆناغێکی تر ئامرازی چاندن و دورینەوە و وەبەرهینان دۆزرایەوە ژیان بوە ماددەیەکی رووت، موڵکایەتی تاك گۆڕا لە موڵکایەتی کشتوکاڵی دەرەبەگایەتی بۆ موڵکایەتی پیشەسازی سەرمایەداری، چینی خاوەن کۆمپانیا و کارگە پەیدابوون لە سەرمایەدارەکان، جوتیار گۆڕا بۆ کرێکار لە کارگەکان. دواتر گرفتی نێوان کرێکار و خاوەن ماڵ و کارگەکان پەیدابوو، لێرەوە شیوعیەت سەری هەڵداوە لەبەر هۆکاری ماددی نا، بەڵکو لەبەر هۆکاری ئابووری. لەم قۆناغە تایبەتە لەلای (مارکس) و هەڵگرانی ئەم بیردۆزە خەڵك جارێکیتر گەڕایەوە سەر ژیانی شیوعیەت. خاوەنداریەتی تاك هەڵوەشایەوە، شیوعیەت بووە سیستەمی ژیانی هەموو خەڵك. لە خواردن و خواردنەوە، ماڵ و سەروەت، تا دەگاتە ئافرەتیش بەیەکەوە بەشداربن بەبێ جیاوازی، بەبڕوای ئەوان جارێکی تر مرۆڤەکان گەڕانەوە سەر ژیانی فریشتەکان، وەك ئەوەی لە قۆناغی یەکەم لەسەری بوون[١].



## دیارترین بۆچوون و یاسایەکانی بیردۆزی مارکس (شیوعیەت)

مارکس لەبەر ئەوەی سیستەمی ئابووری داڕشتبوو تاڕادەیەك سەرنجی کۆمەڵگەی ئەو کاتەی ڕاکێشابوو، بەتایبەت وەك بەدیلێکی ئیسلامی بانگەشەی بۆ دەکرد، تاڕادەیەك لەگەڵ داروینی (التطور)یش هاوسەنگییەکی ڕاگرتبوو، (شوێنکەوتەی هەبوو چەندین حیزب و دەزگا و ڕێکخراوی جیهانی پەیڕەوی بۆچوونەکانی مارکسیان دەکرد، تەنانەت بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردیش لە کوردستان کە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانە، ساڵەهای ساڵ بانگێشەیان بۆ ئەو ڕاوبۆچوونە دەکرد! بەتایبەتی لە کوردستان سیستەمی دەرەبەگایەتی جوتیاری ئەو سەردەمەی زۆر چەوساندبوو) پێیان وابوو ئەم سیستەمە ڕزگاریان دەکات و ژیانی تاکێکی کرێکار وەك ئاغا و سەرمایەدارێکی لێ دێت! هەرچەندە لە

---

(١) مذاهب فكرية معاصرة محمد قطب (ل ١٠٥)

کوردستان شیوعیەت پەردەپۆشی لایەنی (ئیلحادی فکری) مارکسی کردبوو، چونکە خەڵکەکە لە (٩٥٪) موسوڵمانە، ئەگەر بەئاشکرا بیردۆزی مارکس باس بکەن کۆمەڵگە بەدوایان ناکەوێ، هۆشیاری فکریش ئەوکات زۆرلاواز بوو، وتاری ئاینی کورتکرابووەوە لەلایەن تەوەرەی نێوان خۆی و خودا، بۆیە چەندین ڕووداوی سەیروسەمەرە هەیە لەم بارەیەوە، خەڵك لە کوردستان ئەندامی حیزبی شیوعی بوو لە کۆڕوکۆبونەوە و بانگەشە بۆ شیوعیەت بەشدار دەبوو، نوێژیشی دەکرد، پییێ وابوو هیچ تێکگیرانێك لە نێوانیاندا نییە، ئەمە کارەساتێکی زۆر گەورەیە بەتایبەتی وتاری ئایینی نەیانتوانی بوو خەڵك تێبگەینن لەڕووی فکریەوە، کە مارکسیەت، شوعیەت، بۆ سیستەمی ژیان دانراوە لەبری ئیسلام. زۆر باوە لەنێو کۆمەڵگەی کوردی دەڵێت: کادیرێك چەندین ساڵ بۆ خزمەتی فکری مارکسیەت و شیوعیەت کاری دەکرد، لە کۆتاییدا لە کۆبونەوەیەك هەندێك بۆچوونی مارکسیەت باسکرابوو، لەوێ هاتبووە دەرەوەی کۆبونەوەکە، گوتبووی بەخودا ئێستا دەزانم کە شیوعیەتیش بۆ خودا کارناکات و بۆ خودای نییە، لەوەش سەیرتر زۆربەی کۆبوونەوەکانی شیوعیەت لە کوردستان، مامۆستای ئایینی تێدابوو و وتار و (جومعە و جەماعەتی) بۆ خەڵك دەکرد، لێرەدا دوای باسکردنی بیردۆز و تیۆرو بیروبۆچونی ئەم قوتابخانانە بۆمان دەردەکەوێ، کە چەند پێویستە کار لەسەر لایەنی فکری کۆمەڵگا بکرێت. مامۆستایەکی ئایینی کە بەحیساب سیمبوڵی ئیسلامە، کە نەزانێ شیوعیەت سیستەمە و بۆ بەدیلی ئیسلام دانراوە، دەبێ تاکەکانی کۆمەڵگە چۆن بیربکەنەوە! بۆیە، زۆر بەپێویست زانرا سەرجەم ئەم فکرانە بەکورتی لێرەدا شی بکرێتەوە تاوەکو تاکی کورد زۆرباش ئاشنابێ بەم بیردۆزانە، لەئێستادا فکرەی علمانی هەڵگری هەمان فکری قوتابخانە جیاوازەکانی پیشووترە، ئەم جارەیان بەشێواز و بەرگێکی تر هاتووە، ئەگەرنا بەپێی تێڕوانینیان، چەمکەکانی ژیان، ئایین، ئەخلاق، بەها، هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ بیردۆز و تیۆرەکانی تر، بەڵام بەشێواز و ئامراز و پەردە پۆشێکی تر.

## بۆچوون و بنەماکانی مارکس و بیردۆزەکەی

١- ئینکارکردنی بوونی خودا، وای دادەنێن مادە بێ سەرەتا و بێ کۆتایە، مادە هەموو شتێکە لە بوون.

٢- مارکسیەت بڕوای وایە فکرەی بوونی خودای پەروەردگار مرۆڤ دروستیکردووە، ئەگەرنا خودا بوونی نییە، تەفسیری جوڵەی مادە و گۆڕانکارییەکانی بونەوەر دەکەن بەناونیشانی (المادية الجدلية)، ئەم فکرەیەش مارکس لە فەیلەسوف (هیگڵ)ی[1] وەرگرتووە .

٣- مێژووی مرۆڤایەتی بەمادە تەفسیردەکەن، پێیان وایە مێژووی مرۆڤایەتی ملکەچە لەژێر سیستەمی (المادية الجدلية)، پیان وایە سروشتی مادە و ژیان بەرهەمی ماددەیە.

٤- شیوعیەت یان (الاشتراكية العلمية): تاکە مەزهەبی ئابوورییە، کە خاوەنداریەتی تاك (الملكية الفردية) هەڵدەوەشێنێتەوە، بەگشتی واتا لەم بیردۆزە هیچ کەس خاوەنی ماڵ نییە، دەوڵەت نوێنەری کۆمەڵگەیە و خاوەنی هەمووشتێکە، بەپێی ئەم یاسەیە (من كل حسب استطاعته، وكل حسب حاجته)، واتە: (هەرکەس بەپێی توانا کاردەکات، بۆ هەموو کەسێکیش بەپێی پێویستی دەبات.

٥- سیستەمی کۆمەڵایەتی لە دەوڵەتی شیوعی دادەمەزرێت لەسەر فراوانترین ئازادی کەسیەتی، بەمەرجێك دژ و پێچەوانە نەبێت لەگەڵ یاسای دەوڵەت و فەرمانەکانی. ئەگەر شیوعیەت گەیشتە مەبەست، خێزان (الاسرة) هەڵدەوەشێتەوە،

---

(١) هیگڵ: ناوی (جۆرج فلهلم هیگڵ)ە لە ساڵی (١٧٧٠) لە ئەڵمانیا لەدایك بووە، لە گەورەترین فەیلەسوفەکانە، کاریگەری لەسەر بیردۆزی (وجودی) و (مارکسی)هەیە، لە بواری دیالیکتیك (الجدل)، لەساڵی (١٨٣٠) کۆچی دوایی کردووە. چەند پەرتوکێکی هەیە بەناوی (علم المنطق، فلسفة الحقوق، موسوعة العلوم السياسة، فنو مینولوجیا الروح، القضايا الفكرية المعاصرة) (ب ١- ل ١٦٥) مالك بن نبى وموقفه من زكريا (ل١٠) هيگل ابراهيم.

ئەوکات پەیوەندی (جنس) بەفراوانی دەبێت، هەموو پیاوێك بۆ هەموو ئافرەتێکە منداڵیش وەچەی دەوڵەتی شیوعیە.

٦- بەهاوئەخلاق کۆمەڵگە هەڵدەوەشێتەوە، تەنها کۆمەڵگە گوێڕایەڵی دەوڵەتی شیوعیەت دەکات، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات و بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراوی دەوڵەت کۆمەڵگە دەڕوا بەڕێوە.

٧- سیستەمی سیاسی و کارگێڕی لە دەوڵەتی شیوعی دیکتاتۆریەکی داپڵۆسێنەرە، کە سەرکردایەتی دەستە (جەمعی) بەڕێوەی دەبات، لە لوتکەکەی حیزبی شیوعیە، ئەم دکتاتۆریە پێی دەڵێن پرۆلیتاریە[١].

ئەم بەشە کورتەیەك بوو لەم (مەبادیئە) سەردەمیانەی لە جیهانی ئەوروپا سەریهەڵدا، دوایی بە شێوازێکی جیاجیا هاتە نێو جیهانی ئیسلامی، کەمتر لە سەدەیەك سەرجەم ئەم بیردۆزانە، کە لۆبی جیهانی لە پشت بوو زۆربەیان لە ناوەڕۆك لەیەکدەچون، خۆیان بە تەواوکەری یەکتر دادەنا، گشتیان بۆ ئەوە هاتبوون ببن بە (بەدیلی) ئیسلام، لە کۆتاییدا وردەوردە توانەوە و بوون بە کەفی سەر ئاو.

﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾[٢]

واتە: (جا ئەوەی کەف و کوڵە وبێسوود و بێ کەڵکە دەڕوات و دەپوکێتەوە، بەڵام ئەوەی، کە سوود بەخش و بەکەڵکە بۆ خەڵکی لەسەر زەویدا هەر ئەوە دەمێنێتەوە). هیچ پێوەرێکی زانستیان پەیڕەو نەکرد، بیردۆزەکانیان پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیك و (فطرەت) و زانست بوو، کوا ئەمانەتی زانستی و فکری لەم بیردۆزانە؟ دیارە لە کۆتاییدا هەر هەق، (ئەگەر بەرامبەریشی لە قۆناغێکدا زۆر بە هێزکرابێ) هەر بەسەریدا زاڵ دەبێت.

﴿ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴾[٣]

---

(١) مذاهب فكرية معاصرة محمد قطب (ل ١٠٣)، كواشف زيون في المذاهب الفكرية المعاصرة (ل ٤٦٤)

(٢) سورەتی الرعد ئایەتی (١٧)

(٣) سورەتی الإسراء ئایەتی (٨١)

واتە: (بڵێ: تازە حەق و ڕاستی هاتووەو بەرپا بووەو بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووەو جێگیر نەبووەو بەزیووە).

## وەڵامی ڕاست

دوای سەردێکی مێژوویی فەلسەفەی هەڵبژێردراو لە تیۆر و بیردۆزەکانی عەلمانیەتی سەردەم، بینیمان زۆربەی بیرۆکە فەلسەفیەکان بۆ وەڵامدانەوەی ڕاستی چەند پرسیارێك هاتوون، تا مرۆڤ بەرچاورون بێت، لە بەختەوەری دابیت، ئامانجی بزانێ، هاتنی بۆسەر دونیا و پیشە و چارەنوسی دیاری بکرێت بەکورتی ئەم سێ پرسیارە هاوبەشە، گشت مرۆڤەکان دەیکەن: بێ باوەڕ، باوەڕدار، لە کۆن، لەئێستادا بەبێ جیاوازی بیردۆز و تیۆرەکانیش، هەر بەدوای وەڵامی ئەم سێ پرسیارە وێڵن! هەر وەڵامێکیش لەم بیردۆزانە درابێتەوە، لەکۆتاییدا پێچەوانەی فیترەت و عەقڵ و دەروون و زانست و (واقع) و دواتریش نەقڵ (وحی) بووە.

### پرسیارەکان

**یەکەم:** لە کێوە هاتووین؟

**دووەم:** بۆچی هاتووین؟

**سێیەم:** بەرەو کوێ دەگەڕێنەوە؟

ئیسلام وەڵامی ڕاست و دروست و تەواوی ئەم سێ پرسیارەی داوەتەوە، بێ ئەوەی تائێستا دژ بێ، یان پێچەوانەی عەقڵ و زانست و سایکۆلۆژی و پێشکەوتنی سەردەم بێت.

## وەڵامی پرسیاری یەکەم: لەکوێ هاتووین؟

خودای گەورە باسی سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەکان دەکات بە قۆناغ بەندی، بەشێوازێکی زۆرورد تائێستا هیچ لێکۆڵینەوە و (دیراسەیەك)، تەنانەت پزیشکی یان بوارەکانی تر نەیان توانیوە پێچەوانەی ئەم ڕاستەیە بڕیار بدەن، لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

١- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ ﴾(١)

واتە: (ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا نەوەکان لە نوتفەیەك پەیدابوون، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواو و سەروسیمادار، یان ناتەواو، هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان، تا بۆتان ڕوون بکەینەوە، کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروست کردووە و دووبارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین، تاکاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووکی دەرتان دەهێنین لە سکی دایکتان، دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێز و تواناتان، هەتانە دەمرێنرێت بەگەنجی، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەڕپووتترنی تەمەنەکان، بۆ ئەوەی هیچ شتێك نەزانێت دوای ئەوەی جاران دەیزانی.

---

(١) سورەتی الحج ئایەتی (٥)

٢- ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾(١)

واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بە دیهێناوە. لەوەودوا لە جێگەیەکی پارێزراو و لەباردا کە منداڵدانی دایکە، لەشێوەی نوتفەیەکی زۆر بچووکدا دامان مەزراندووە. لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بە خۆهەڵواسەرێك سەرە مێکوتەیەك، پاشان خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەك، ئینجا شێوازی گۆشتپارەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیوە و بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوسا لەشێوەیەکی تردا دەرمانهێناوە، کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێکوپێکە و ڕۆحی پێ بەخشراوە، بەڕاستی خوای مەزن بەرز و پیرۆز و موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەر و چاکترین دروستکارە).

٣- ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾(٢)

واتە: (ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بەچاکی و ڕێکوپێکی بەدیهێناوە، لەسەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروستکردووە، پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادە و بێ نرخ بەدیهێناوە، پاشان ئادەمیزادی بەڕێکوپێکی ڕێکخست، لە روح و گیانێك کە خۆی خاوەنیەتی فوی پێداکرد، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێبەخشیون، کەمتان سوپاسگوزارن).

---

(١) سورەتی المؤمنون ئایەتی (١٢ - ١٤)

(٢) سورەتی السجدة ئایەتی (٧- ٩)

٤- ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾(١)

واتە: (بەڕاستی ماوەیەكی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات، كە شتێكی وا نەبوو ناو ببرێت. بێگومان ئێمە ئینسانمان دروستكرد لە تێكەڵەیەك لە سەرەمێكوتەیەكی بچووك و هێلكۆكەیەك، لەكاتێكدا دەمانەوێت تاقی بكەینەوە، هەربۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێبەخشی).

ئەم ئایەتانە باس لە سەرەتای دروستبوونی یەكەم مرۆڤ دەكات لەسەر زەوی كە (ئادەمە سڵاوی خۆی لەسەر بێ). لە خۆر (گڵ) دروستكراوە، دواتر مرۆڤەكان لەڕێی هاوسەرگیریەوە تنۆكێك ئاو (مەنی) دروست دەبن، تا دوا قۆناغ دروست بوون. گشت زانستی دونیا یەك دەنگە، كە مرۆڤ سەرەتاكەی لە گڵە، دواتر هەموو لێكۆڵینەوی پزیشكی ئەم ڕاستیە دەردەخات كە لەدوای هاوسەرگیری كۆرپەلە (مەن)ی قۆناغەكانی تر دروست دەبێت.

لەوەدوا بۆمان دەردەكەوێت، بیردۆزەكان بەتایبەتی داروین، چەندە بەهەڵەدا چووە كاتێك دەڵێت سەرەتای مرۆڤەكان میمونە! یان لە پاشماوەی كەركەدەن و گیاندارەكانی تر لە ئەنجامی گەشە (التطور) گەیشتووتە لوتكە!

---

(١) سورەتی الإنسان ئایەتی (١ - ٢)

## وەڵامی پرسیاری دووەم: ئێمە بۆچی هاتووین؟

واتە: ئامانج لە هاتنی مرۆڤەکان بۆ سەر زەوەی چییە؟ لەم چەند بیردۆزەی پێشوو بۆمان ڕوون بۆوە، کە هەندێکیان پێیان وابوو ژیان مادده بەڕێوەی دەبا، یان ئامانج لە هاتن (جنسە) و بەس. لە کۆتاییدا بیردۆزەکان بۆ خۆیان دژیەك و پێچەوانەن.

- ئیسلام وەڵامێکی ڕاست و دروستی داوەتەوە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[١]

واتە: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە، تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

واتای بەندایەتی بۆ خودا، بەفراوانیەکەی پێکهاتووە لەناسینی خودا و پایەکانی (ئیمان)، عیبادەت و جۆرەکانی، ناسینی مرۆڤ و ئامانج و ئاواتەکانی، پەیوەندی خۆی لەگەڵ خۆی، لەگەڵ دەوروبەری، لەگەڵ خێزان و کۆمەڵگە، ئاوەدانکردنەوەی زەوی، داهێنان، خزمەتکردن هتد...، ئەوانە هەمووی لە بازنەی بەندایەتی کردن بۆ خودا خزمەتی تەواوی مرۆڤەکانی تێدایە، لەگەڵ خۆش بەختی و خۆشگوزەرانی.

### بیردۆزەکانی تر چۆن دەڕواننە ئەم پرسیارە

بیردۆزەکانی تر چۆن دەڕواننە ئەم پرسیارە؟ قورئان پێش هاتنی ئەم بیردۆزانە وەصفیان دەکات، بۆ چونیان دیاری دەکات، بۆچی هاتوون؟

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾[٢]

---

(١) سورەتی الذاريات ئایەتی (٥٦)

(٢) سورەتی محمد ئایەتی (١٢) .

واتە: (ئەوانەش بێ بڕوا بوون لەم دنیایەدا ڕادەبوێرن و دەخۆن وەك ئاژەڵ، لە ئایندەشدا دۆزەخ جێ و شوێنیانە).

ئەم بۆچوونە لەپێش چواردە سەدە بۆچوونی کافرەکان بوو، بۆ وەڵامی پرسیاری بۆچی هاتوویین؟ دەڵێن: هاتنمان تەنها خواردن و خواردنەوەیە، وەك لەبەرگیانەبەر، بیردۆزو تێروانینەکانیش ئێستا هاتنیان بۆ دونیا بەوە دەزانن، کە ماددیە یان (جنسە) هتد....



## وەڵامی پرسیاری سێیەم: دەگەڕێینەوە بۆ کوێ؟

هەندێك لە بیردۆزەکان پێیان وابوو نەمانی مرۆڤەکان تەنها لەبەر لاوازی و بێ سوودی نامینێ، تەواوی تیۆرەکان بڕوایان بە پەنهان (غەیبیات) نییە، بڕوانەبوون بە (غەیبیات) واتە: بڕوانەبوون بەتەواوی ڕووداوەکانی دواڕۆژ، وەك مردن، ناو گۆڕ، زیندوبوونەوە، (حیساب)، پاداشت، سزا، بە هەشت، جەهەننەم هتد...، دووبارە قورئان پێش هاتنی ئەم بیردۆزانە نیەت و بۆچوونی تۆمار کردوون.

**لە بارەی وەڵامی پرسیاری سێیەم لە بارەیانەوە دەفەرمووێ:**

﴿ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴾[1]

واتە: (دەڵێن: باشە ئەگەر مردین و بووینە خاك و خۆڵ و ئێسك، ئایا ئێمە دووبارە زیندوو دەکرێینەوە).

﴿ وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾[2]

---

(١) سورەتی المؤمنون ئایەتی (٨٢) .

(٢) سورەتی الجاثیة ئایەتی (٢٤)

واتە: (خوانەناسان دەیانووت ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگار و (زەمانە) کایگەرن تیاماندا و دەمانمرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیارییەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن).

ئیسلام زۆر بەڕوونی وەڵامی پرسیاری سێیەم دەداتەوە، هیچ کەس ناتوانێ نکۆلی لێ بکات . دەفەرمووێ: ﴿ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴾[1]



واتە: (چونکە ئەوانە بێگومانن کە بۆ لای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە.).

﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾[2]

واتە: ئەوانەی دەزانن بێگومان بە دیداری پەروەردگاریان شاد دەبن و باوەڕی پتەویان هەیە، کە بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە.

بابەتی ئێمە وەڵامدانەوەی بیردۆزەکان نییە، ئەگینا دەبوو خاڵ بەخاڵ لەسەر بیردۆز و تێڕوانینەکان ڕابوەستین و وەڵامیان بدەینەوە، بەڵام بە وەڵامی ئەم سێ پرسیارە کۆتاییان پێدەهێنین دەچینەوە سەر بابەتی خۆمان.

---

(١) سورەتی المؤمنون ئایەتی (٦٠) .

(٢) سورەتی البقره ئایەتی (٤٦) .

## کەسایەتی ( الشخصية )

پێگەیاندنی تاك چارسەرێکی سەرجەم ئایین و فکرەو مبدء و بیردۆزەکان بوە، هەریەك لەوانە ململانێکی بە هێزیان لە نێوانیاندا بوە، تا زۆر ترین کەسایەتی دروست بکەن لەسەر ئەم تێگەیشتن و بیروڕاو بۆ چون و بنەمایانەی قەناعەتیان پێیەتی. مرۆڤ لە سروشت بەرپرسیارێەتیەکی گەورەی لە ئەستۆیە، بەرپرسیاریەتی بە بێ پێگەیاندنی تاك لەڕووی فکریەوە دروست نابێت، تاك پێویستی بە پێگەیاندنە لەڕوی بونیاتنانی لە لایەنی دین و عەقل و فکری، تاك لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە شارستانیەت بونیات بنێ تا ژیانێك بەرپابکات، یاساو دەستور و پێکەوە ژیانی تێدا بێت، لەڕووی مێژووییەوە بەرپرسیارەتی لە ئەستۆیە، باشترین تاك کەسایەتی پێشکەش بە مێژووی مرۆڤایەتی بکات، ئاوڕ لە مێژوو بدەوە ململانێی فکرە و شارستانیەت و هێز و دەسەڵات بێ پچڕان بووە، هەموو ئومەتێك هەوڵی خۆسەپاندن دەدات، لە ڕووی کلتور و ژیاری و ئەخلاقی هتد...، بەتایبەتی لەئێستادا جیهانگەرایی (عەولەمە) و بیردۆز و کلتور و شارستانیەت خۆیان بەسەر میللەتانی تر دەسەپێنن، بۆ ئەوەی شوناسی کەسێتی بەرامبەرەکانیان ڕەش بکەنەوە، شەپۆلێکی بەهێز هەیە بۆ سڕینەوەی ناسنامەی تاك لە ئێستادا، ناکرێ موسڵمان خۆی لەم شەپۆلە بێئاگا بکات و تاکەکانی بێ ناسنامە بمێنێنەوە، یان ناسنامەی میللەتێکی دوور لە بەها و ئەخلاق هەڵگرن، بەهێزی ئەم شەپۆلە و لاوازی کەسیەتی ئێمە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

١- سستی و تەمبەڵی و خۆ بە بەرپرسیار نەزانین

٢- بڕوانەبوون بەم (مەبدەئە) ڕاست و دروستەی ئیسلام

ئەگەر هەست بە بەرپرسیارەتی نەکەین لە بەرامبەر ئەم شەپۆلە، کە کەسایەتیمان ڕەش دەکاتەوە دواتر هەمووماں بەبێ ناسنامە دەمینێینەوە، تێدا لەنێودەچین وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(مَثَلُ القَائِمِ فِي حُدُودِ اللَّه والْوَاقِعِ فيها، كَمثل قَومٍ اسْتَهَموا علي سَفِينَةٍ، فَأَصابَ بَعْضُهم أعْلاهَا، وبعضُهم أَسْفلَهَا، فكان الذي في أَسفلها إذا استَقَوْا من الماء مَرُّوا على مَنْ فَوقَهِمْ، فقالوا: لو أنا خَرَقْنا في نَصِيبِنَا خَرقا ولَمْ نُؤذِ مَنْ فَوقَنا؟ فإن تَرَكُوهُمْ وما أَرَادوا هَلَكوا وهلكوا جَميعا، وإنْ أخذُوا علي أيديِهِمْ نَجَوْا ونَجَوْا جَميعا)[١]



واتە: (وێنەی ئەو کەسەی فەرمانەکانی خودا جێبەجێ دەکات و لەگەڵی دەژی، وەکو ئەو قەومە وایە لە ناو کەشتیەك بن، کەشتیەکە دوو نهۆم بێت، هەندێکیان لەسەرەوە و هەندێکیان لە خوارەوە، ئەوانەی لە خوارەوەن ئەگەر ئاویان پێویست بێت بەلای ئەوانی سەرەوە تێدەپەڕن، دەڵێن: ئەگەر بێتو ئێمە لە ژێرەوە لەلای خۆمان کونێك لە کەشتیەکە بکەین ئەوانەی سەرەوە ئەزیەت نادەین، لەلای خۆمان ئاوەکە دەردەهێنین، ئەگەر لێیان بگەڕێن کەشتیەکە کون بکەن ئەوانەی سەرێ و خوارێ گشتیان بەهیلاك دەچن، ئەگەر دەستیان بگرن و نەهێڵن، ئەوانەی سەرێ و خوارێ ڕزگاریان دەبێت. ئێمەش ئەگەر بەری ئەم شەپۆلە نەگرین ئەوە هەمووماں لە نێودەچین).

## پێناسەی کەسایەتی (الشخصية)

وشەی کەسایەتی (الشخصية) بەکارهێنانی یەکێکە لەم چەمکە سەردەمیانەی لە سەدەمی بیستەم سەری هەڵدا، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی بەکارهێنانیدا سەردەمیە، بێگومان ڕای جیا لەسەر پێناسەکەی هەیە، بۆیە پێویستە بچینە سەر پێناسەی زمانەوانیەکەی، (ئیبن فارس) دەڵێت: (الشخص: سواد الانسان تراه من بعد)[٢]، واتە: (تارماییەکی ڕەش مرۆڤ لەدوورەوە دەیبینی).

---

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە (٢٤٩٣)

(٢) مجمل اللغة لابن فارس (ب ١ - ل ٥٤٤)

له (لسان العرب)دا دەڵێت: (الشخص: كل جسم له ارتفاع وظهور، والمراد به اثبات الذات)[1]، واته: (كەسایەتی: هەموو لاشەیەك درێژی هەبی و دەربکەوێ، مەبەست پێیی جێگیرکردنی کەسێکە).

## پێناسەی کەسیاتی لە بەکارهێنانیدا:

زانایانی دەروونناسی و پەروەردەیی پێناسەکانیان بۆ کەسایەتی جیاوازە لەگەڵ زانایانی (شەریعەت)، تەنها هەر پێناسەیەك لە بوارێکیان وەردەگرین:

**پێناسەی کەسایەتی لای دەروونناسەکان:** (الشخصيه هي مجموعة سمات الفرد، كما تبدو في عاداته الفكرية، وتعبيراته واتجاهاته وأسلوبه في العمل، وفلسفته في الحياة)[2]. واته: (کەسایەتی کۆمەڵێك نیشانەی تاکە، دەردەکەوێ لە عادەتی و بیرکردنەوە و دەربڕین و ڕێڕەو، شێوازی لە کارکردن، فەلسەفەی لە ژیان).

**(شێخ هیشام بەدرانی) دەڵێت:** (الشخصيه هي مجموع الخصائص الثقافية والمعرفية، التي يحملها الانسان ويعتقدها، وطرائقة السلوكية، التى تحدد نوع تكيفه للواقع الڑى يعيشه، بما يميزه عن سائر الناس)[3]، واته: (کەسایەتی کۆمەڵێك تایبەتمەندی ڕۆشنبیری و زانیاریە، مرۆڤ بڕوای پێیەتی، هەڵیدەگرێ، هەروەها ئەم ڕێکارە سلوکیانەیە کە جۆرەکەی لەنێو کۆمەڵگە و واقیع کەتێیدا دەژیت دیاری دەکرێت، لە هەموو خەڵك پێی جیادەکریتەوە).

**(یەحیا شطناوي) دەڵێت:** (الشخصية الاسلامية: فهي كل من يفكر على أساس الاسلام، ويجعل هواه تبقا للإسلام، ويطبق الاسلام على نفسه)[4]، واته: (کەسایەتی ئیسلامی ئەو کەسەیە کە بیردەکاتەوە لەسەر بنەما و بنچینەی



---

(١) لسان العرب (ب٧ - ل٤٥)

(٢) اصول علم النفس العام في ضوء الاسلام (ل ٢٢٦)

(٣) الشخصيه الاسلاميه للنبهانى بتحقيق هشام بدرانى (ل ٤٥٢)

(٤) التربية الاسلامية والقرن الخامس عشر الهجري (ل ٢٦)

ئیسلام، هەوا و هەوەسی بەدوای ئیسلام دەگەڕێ و ئیسلام بەتەواوی لەسەرخۆی جێبەجی دەکات).

کەسایەتی ئیسلامی لە دیارترین و جیاوازترین کەسایەتی مێژوویە، تایبەتمەندی جیاوازی هەیە وەك، بڕوابوونی بەخوا، بە پێی (مەنهەنجێکی ڕەبانی) هەنگاو دەنێت، لەسەر دەستورێکی قورئانیە هەڵەی تێدا نییە، پێشەنگەکەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) گەورەی مرۆڤایەتییە، گرنگی زۆری بە تاکی ئیسلام دراوە لەهەموو بوارەکانی ژیان.



## بنەما (مقومات) بەهێزەکانی کەسایەتی ئیسلامی و جۆرەکانی

**کەسایەتی ئیسلامی بەپێی چەند بنەمایەکی سەرەکی لە کەسایەتیەکانی تر جیادەکرێتەوە، چوار بنەمای سەرەکین:**

**یەکەم:** بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست.

**دووەم:** بەندایەتی تەنها بۆ خودای پەروەردگار.

**سێیەم:** هەڵسوکەوتی شەرعی بەپێی شەریعەتی خودا.

**چوارەم:** ئەخلاق و سلوکی جوان و بەرز و بەرێز.

## جۆرەکانی کەسایەتی ئیسلامی:

### کەسایەتی ئیسلامی لە سێ جۆر بە دەرنییە:

**یەکەم:** زانا (عالم).

**دووەم:** فێرخواز، قوتابی (متعلم) .

**سێیەم:** کەمتەرخەم، فەرامۆشکار (مهمل) .

زانا و فێرخواز دەبن بە دوو بەشی سەرەکی، یان کەسێکی (ئیجابی یە)، بیرکردنەوەی تەندروستە، لەگەڵ (واقع) هەنگاو دەنێت و تێدەگات. یان (سلبیە) بە فکرە، ئەویش سێ حاڵەتی هەیە. (غافلە)، یان (جاهلە)، یان لادەر (منحرف)، لەڕووی فکرەوە دوو دڵە، گوماناوییە لە ڕووی زانست.

## کەسایەتی ئەرێنی (ئیجابی):

### کەسایەتی (ئیجابی) شەش جۆر و حاڵەتی هەیە:

**یەکەم:** کەسایەتی خودایی (ڕەبانی): ئەم جۆرەیان شارەزایە بە قورئان، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ﴾[(١)]

واتە: بەڵکو (بەخەڵکیان وتووە) هەوڵ بدەن بۆ خوا بژین و لێبڕاو بن، بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار هەوڵ بدەن، بەوەش دەبنە خواناس و ڕەبانی، کە بەرنامەی خوا فێری خەڵکی بکەن و خۆشتان بەردەوام هەوڵ بدەن فێری ببن).

---

(١) سورەتی ال عمران ئایەتی (٧٩)

**دووەم:** کەسایەتی پشتگیر (الحواری) (ناصر لدین الله) : ئەم جۆرەیان وەك پشتگیرانی (عیسی) (سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێ) پشتگیری هەق و بانگەوازی ئیسلامین:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ ﴾(١)

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە ببنە پشتیوانی بەرنامە و دینی خوا ببینە لایەنگری پەروەردگار، هەروەکو عیسای کوڕی مەریەم بە حەواریەکانی هاوەڵی وت: کێ پشتیوان و یارو یاوەرمە بۆ ڕێبازی خوا، حەواری و هاوەڵەکانی وتیان: ئێمە ئامادەین ببینە پشتیوان و لایەنگیری خوا).



**سێیەم:** کەسایەتی زانا و ڕۆشنبیر، ئەم جۆرەیان لە قورئان بە (ئەحبار) ناویان هاتووە:

﴿ لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾(٢)

واتە: (ئایا ئەوە تاکەی خواناس و زاناکانیان قەدەغەی گوفتاری گوناهـ و حەرامخۆریان لێناکەن؟ سوێند بێت ئەو کردەوە و هەڵسوکەوتەی، کە دەیکەن بۆ ڕازیکردنی خەڵك زۆر نادروست و خراپ و ناپەسەندە).

**چوارەم:** کەسایەتی هەڵنجێنەر (المستنبط): ئەم جۆرە وردبین و شارەزایە لە هەڵێنجاندنی (ئەحکام)، مانای ڕاست و دروست دەزانێ. خودای گەورە (وەصفی) دەکات دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ

---

(١) سورەتی الصف ئایەتی (١٤)

(٢) سورەتی المائدە ئایەتی (٦٣)

أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ ﴾[(١)]

واتە: (لێرەدا خوا ڕەخنە دەگرێت لە هەندێك ئیمانداران، هەركاتێك هەواڵێكیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی، یاخود ترس و بیم، بڵاوی دەكەنەوە، بیر لە سەرئەنجام ناكەنەوە، خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەكردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یان بۆ لای كاربەدەستانێك كەلە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی كەلە نهێنی هەواڵەكان تێدەگەن و دەكۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەكانیان لێ دەردەهێنا).



**پێنجەم:** كەسایەتی پێشەنگ (رائد): ئەم جۆرە، كەسایەتییەكی پێشەنگە، لەزۆربەی كارەكان دەستگرە بۆ دواكەوتووەكانی خۆی.

**شەشەم:** كەسایەتی ئاسایی (عامی): ئەم جۆرە هەقی خۆش دەوێ، پشتگیری لە ڕاستییەكان دەكات، ژمارەی موسڵمانان زیاد دەكات، ئەوەندەی، كە دەزانێ شوێنكەوتووی هەقە.

## تایبەتمەندیەکانی ئەم شەش جۆرە

**هەرجۆرێک لەمانە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە، لەوانی تر جیا دەبێتەوە.**

**• کەسایەتی خودایی (الرباني):**

پێنج تایبەتمەندی هەیە:

١- زانست ٢- (فقه) ٣- لەسەرخۆ (الحلم) ٤- دانایی ٥- چاوساغ و شارەزا لە سیاسەت

---

(١) سورەتی النساء ئایەتی (٨٣)

**• کەسایەتی (حەواری):**

چوار تایبەتمەندی هەیە:

١- پاك و بێگەرد (الصفاء) ٢- پاك و پوخت (النقاء) ٣- دەستپێشخەری بۆ یارمەتی و سەرخستن ٤- پشتگیری لە هەق

**• کەسایەتی زانا و ڕۆشنبیر (حبر):**

ئەمەش چوار تایبەتمەندی هەیە:

١- پڕ لە زانست ٢- جوان وردبونەوە و لێڕامان ٣- فێرکردن ٤- (مدرس)

**• کەسایەتی پێشەنگ (رائد):**

ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

١- خۆشەویستە ٢- چاکسازە ٣- گرنگی بەکاروباری موسڵمانان دەدات ٤- بوارێکی فراوان دەڕەخسێنێ بۆکارکردن[1].

---

(١) اصول العلم ومنهجیه الاقراء والدرس، هشام البدرانی (ل ٤٤) .

## هۆشیاری سیاسی:

### مەبەست لە هۆشیاری سیاسی چی یە؟

قسەکردن لەسەر بابەتە فکریەکان، ڕاماندەکێشێ بەرەو بابەتی هەستیار، بەتایبەتی هۆشیاری سیاسی، مەبەست لە هۆشیاری سیاسی ئەوە نییە مرۆڤەکان لەحاڵ و باسی سیاسی و دەوڵەتی و جیهانی و خۆجێی شارەزابن، یان بەو کەسانە بگوترێ خاون هۆشیاری سیاسین، کە چاودێری ڕووداوی سیاسی و هەواڵی سیاسی دەکەن، یان لە ناو پرسێکی سیاسی دان! لەگەڵ ئەوەی ئەوانە لە پێداویست و داخوازییەکانی هۆشیاری سیاسیە، بەڵکو هۆشیاری سیاسی بە تێڕوانینێکی گشتی بۆ جیهان، لە گۆشەیەکی تایبەتی بناغەی (فکری و عەقیدەیی ئیمانی) بۆ هەر بیردۆز و قوتابخانە و ئایینێك، لە ڕووی هۆشیاری سیاسی جیاوازە، سەبارەت بە موسڵمان هۆشیاری سیاسی بە تێڕوانینی جیهان، بە (عقیدە و ئیمان) لەسەر بنچینەی (لا له الا الله محمد رسول الله)، ئەمەیە هۆشیاری سیاسی لەلای ئێمەی موسڵمان بەتێروانینی جیهان بەبێ بنەمایەکی بەهێزی (ڕەبانی) تێروانینێکی سادەیە، پێی ناڵێن هۆشیاری سیاسی.

**هۆشیاری سیاسی دوو ڕەهەندی سەرەکی هەیە:**

١- لە جیهان بڕوانێ بەگشتی.

٢- بنەمایی ئەم تێڕوانینە لە گۆشەیەکی دیاری کراوبێت. لەلای موسڵمان گۆشەی ئیمانە.

نابێت وا تێبگەین کە هۆشیاری سیاسی کارێکی زۆر گرانە، تەنیا ڕۆشنبیرو سیاسەتمەدار دەتوانن بەم کارە هەڵبستن، بەپێچەوانەوە هۆشیاری سیاسی کارێکی زۆر ئاسانە، هەموو تاکێك بۆی هەیە شارەزابێت لە هۆشیاری سیاسی، چونکە هۆشیاری سیاسی مەرج نییە ئاگاداری هەموو ڕووداوی جیهان بێت، و زانیاری و زانستی هەموو دونیا بزانیّ. دەکرێت هۆشیاری سیاسی هەبێت لەیەك بابەت، یان پرسیکی جیهانی، بە تەنها تێڕوانین لە بابەتێك و خوێندنەوی بابەتێکە بەشێوەیەکی تەندروست، دانانی چارەسەر لە ڕوانگەی ئیسلام، دەکرێت هۆشیاری سیاسی بەهێزبیّ. ڕاستە هۆشیاری سیاسی ڕێژەییەو جیاوازە، هێز و توانای هۆشیاری سیاسی لەگەڵ هێزو توانای زانستی و زانیاری دەگۆڕێت، تا زانست و زانیاریت زۆر بێت، ئەوەندە هۆشیاری سیاسیت بەهێز دەبیت.

## پێناسەی هۆشیاری (الوعی)

**(لسان العرب)دا دەڵێت:** (الوعي: حفظ القلب الشيء، والحديث يعيه وعيا وأوعاه: حفظه وفهمه وقبله فهو واع، وفلان أوعى من فلان اي احفظ وأفهم)[١]

واتە: (هۆشیاری: ئاگاداری ولەبەر کردنی شتێکە لە دڵ، یان بەدڵ لە شتێك ئاگادار بوو . لە فەرموودەیەك گەیشتنی هۆشیاری پیّ هەبوو، لەبەری کرد تێگەیشت، قبولّی کرد، فلان هۆشیارە، فلان هۆشیارترە لە فلان، واتە ژیرتر و تێگەیشتوو ترە. فەرهەنگی دەریا چەند مانەیەکی جوانی بۆ هۆشیاری داناوە دەڵێت:

(**الوعي:** هۆشیاری، بێداری، هەست کردن، ئاگاداری، وریایی، ئەقڵ و ژیری، بەرچاو و دیار[٢]).

---

(١) لسان العرب ( ب١٥ - ل٣٩٦)

(٢) فەرهەنگی دەریا، ڕزگار کەریم (ب ٢ - ل١٦٢٣)

له دوو فەرموودەی پیغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) واتای هۆشیاری زۆر پڕ مانا هاتووه:

١- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەمووێت:

(نضر الله إمرأ سمع مقالتي، فوعاها فأداها، فرُب مبلغ أوعى من سامع)[١]

واته: (بەهاداربێ لەلایەن خوداوه، ئەوکەسەی گوێی له وتەیەکی من دەبێت، تێدەگات و ئەقڵ و ژیری لێ وەردەگرێت، جاری واهەیه ئەو کەسەی پێی گەیشتووه هۆشیارتر و ئاگادارتره لەوکەسەی گوێی لێ بووه).

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەمووێت:

(اقرأ القران، فان الله تعالى لا يعذب قلبا وعي القران)[٢]

واته: (قورئان بخوێنن، بەڕاستی خودای گەوره ئازاری دڵێك نادات هۆشیار و ئاگادار بێت به قورئان.

## پێناسەی هۆشیاری سیاسی

جوانترین پێناسه بەلای منەوه، که هەڵبژێردراوه بەکەمێك دەستکاریەوه لەبەریزان (م. وەلید عەبدولعز و دکتۆر فەتحی یکن)، ئەمەیه هۆشیاری سیاسی واتا تێڕوانینه بۆ جیهان له ڕوانگەیەکی تایبەت، بونیاتنرابێت لەسەر (ئیمان و عەقیده و مەبدەئێکی) ڕوون، موسڵمان بزانێت چی دەگوزەرێت ڕووداو و گۆڕانکارییەکان له دەوروبەری خۆی، تەماشای جیهان بکات به تێڕوانینێکی مێژوویی، سونەتی گەردوون ملکەچی بکات بۆ ئەم بیروباوڕە و ئیمانەی، که هەڵیگرتووه، دەرئەنجامی کاریگەرییەکانی بۆسەرکۆمەڵگە، به ئەندازەیەك کارلێك بکەن ئاستی هۆشیاری بەرز بکاتەوه، تائاستی هەست پێکردن، ئەمەش لەگەڵ فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دێتەوه که دەفەرمووێت:

---

(١) ترمذي گێڕاویەتیەوه

(٢) سنني دارمی ژماره (٣٢٦١)

(من لم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم)

واتە: ( هەر کەسێك گرنگی نەدات بەکاروباری موسلمانان لە ئێمە نیە ) گرنگیدان بە کاروباری موسڵمانان و لێوردبونەوە و تێگەیشتن و خەم خواردن و بەرێوە بردنیانە.

چاودێر و بەڕێوەبردنیش سیاسەتە، هەروەها گرنگیدانیش بریتیەلە هۆشیاری و پەی پێ بردن، کە شوێنی بڕیار و هەست پێکردنە[1].



## بنچینەکانی هۆشیاری سیاسی

**بێگومان ئەم بابەتە گرنگە دەبێت چەند مەرج و بنەمایەکی هەبێت، تا هۆشیاری سیاسی ڕاست و دروست هەبێت لەوانە:**

١- گومەڵگای پڕ لە گرفت و کێشە، ژینگەکەی لە بارترە بۆ هوشیاری سیاسی لە گومەڵگەیەکی دۆگما و ڕاوەستاو، کەواتە لەگۆمەڵگای بە جوڵە هوشیاری سیاسی بەهێزترە.

٢- بە تەنها شارەزا بون لەسیاسەت، کەم و کوڕیە بۆ هۆشیاری سیاسی، بەڵکو هۆشیاری سیاسیی بەهێز ئەوەیە: سنورێکی فراوان بۆ خۆی دیاری بکات لە زانستەکاتی تر، تا هۆشیاریەکەی گشتگیر بێت .

٣- کاتێك تەماشای هەڵوێست و ڕووداوە سیاسیەکان دەکەین، دەبێت دووریان خەینەوە لەوەی، کە بلێین: پەیوەندی بەهیچ شتێك نیە، یان بە پێچەوانەوە پەیوەندی بەهەموو شتێکەوە هەیە، نەخێر دەبێت بۆ تێگەیشتنی هۆشیاری سیاسی هەر ڕوداوێك بە هۆکار و ئەسباب و شوێن و ژینگەی خۆی تەحلیل بکرێت.

---

(١) دوو نوسراوی بەڕێزان (ولید عبدالعز) د.(فتحی یکن) بە ناونیشانی (الوعي السياسي)

٤- دورکەوتنەوە لە گۆشەگیری و لاگیری بۆ لایەنێکی دیاری کراو لە هۆشیاری سیاسی، ئەمە یان کەم و کوڕیەو کاریگەری دەبێت لە سەر بۆچون، هەواڵی درۆ دەکاتە ڕاست، ڕاست دەکاتە درۆ.

٥- دورکەوتنەوە لە هۆشیاری سیاسی بێ ئامانج، خۆ خەریك کردن بۆ هۆشیاری جزئی لەجیاتی هۆشیاری کوللی .

٦- کەسی خاوەن هۆشیاری سیاسی، نابێت خۆی بە زانیاری دەوروبەری ڕازی بێ بەس، دەبێت هۆشیاری سیاسی گشتی و فراوانی هەبێت، ڕایی بگەینێ بۆ هەموو خەڵك بۆ بەرهەڵستکردن لەناو کۆمەلگا.



## ڕێگەکانی پێگەیاندنی تاکی هۆشیاری سیاسی

دەگونجێ چەند ڕێگەیەك بەکورتی دیاری بکەین، تا تاك بتوانێت سوودی لێوە وەربگرێت، بۆ تێگەیشتن لە هۆشیاری سیاسی و ڕووداو و هەڵوێستەکان لەوانە:

### یەکەم: لێکوڵینەوە و (دیراسە) لە (شەریعەتی) ئیسلام

ئیسلام تێڕوانینێکی زۆر فراوان و گشتی هەیە بۆ جیهان و سیاسەت و ڕووداو و پێشهاتەکان، دەکرێ موسڵمان ئەم تێڕوانینە بکاتە پێوەر و بنەما بۆ ڕووداوە سیاسیەکان.

کرداری سیاسی: دەکرێت بەسێ بەش: ١- هۆشیاری سیاسی، ٢- شیکاری سیاسی، ٣- مومارڕسەی کرداری سیاسی.

قورئان و فەرموودەی پغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە تێروتەسەلی باسی هەرسێ پرسی کردووە، پرسی (حاکم و محکوم)، (زاڵم و مەزلوم)، (حکومەت و میللەت)، (ڕەئیس و مەڕئوس)، (گەل و دەوڵەت)، ئەمانەش گشتیان بابەتی سیاسین و پەیوەندییان بە پرۆسەی هۆشیاری سیاسیەوە هەیە.

## دووەم: لێکۆڵینەوە و (دیراسەی) مێژوو

مێژوو پڕە لە بنچینە و بنەمای (واقیعی) سیاسی میللەتان، کە چۆن سەریانهەڵداوە، بەچی پێشکەوتوون،( مقەوماتی بونیان) چی بووە، بەچی و بۆچی لەناوچوون، خاڵی لاواز و بەهێزیان چی بوو، کێ دوژمنی سەرسەختە، بەچی ڕزگاریان بووە لە دەستی دوژمن، گەیشتونەتە کوێ. بەهەمان شێوە (دیراسەی ) مێژوی سەردەم، تەیارە فکریەکان کێن؟ کامیان بەهێزن؟ بۆ بەهێزن؟ کامیان ترسناکن؟ لە کێوە فێربین؟ ئەم پرسیارانە گشتیان بنچینە و ڕێگای بەهێزی هۆشیاری سیاسین.



## سێیەم: بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و شیکاری سیاسی

دیارە چۆن دوورکەوتنەوە لە ڕووداو و هەڵوێستە سیاسییەکان وا لە مرۆڤـ دەکات نەشارەزا بێت و بەهەڵە لە ڕووداوەکان بگات. بەهەمان شێوە بەدواداچوون و شیکاری سیاسی، هۆشیاری سیاسی بەهێز دەکات و ڕاوبۆچوون و هەڵوێستی سەرکەوتوو دەبێت.

### سێ جۆرە تەفکیری سیاسی هەیە:

١- بیرکردنەوەی سیاسی لە سیستەم، وەك دەڵێ: ئەمە سیستەمی ئیسلامییە ئەمە سیستەمی دیموکراسییە.

٢- بیرکردنەوەی سیاسی لە ئامراز و (ئالیەتی حکم) کە پەیوەندی بە کارگێڕی و بەرێوەبردنی وڵات هەیە.

٣- بیرکردنەوەی سیاسی لە هەلی (واقیع) و ڕووداوەکان

هەموو ئەمانە گەشەی هۆشیاری سیاسی زیاد دەکەن، بەڵام ئەوەی زیاتر پەیوەندی بە گەشەی سیاسیەوە هەبێت خاڵی سێیەمە، کە بیرکردنەوەی سیاسییە لە هەواڵ و ڕووداوەکان، چۆن بیبەستینەوە لەگەڵ (واقیع)، بۆ ئەم مەبەستەش دەکرێت سوود لەوانەی خوارەوە ببینین:

أ- زانیاری لەسەر پێوەری (المعیار) سیاسی هەبێ.
ب- زنیاری لەسەر بیردۆزە فكریەكان .
ت- زانیاری لەسەر ڕاگەیاندن و شێوازی گواستنەوەی هەواڵی سیاسی .
ث- زانیاری لەسەر چەمك و زاراوەكانی سەردەم .
ج- ئەرشیفی سیاسی .
ح- نوسراو و هەڵوێست وەرگرتن لەسەر ڕووداوە سیاسیەكان .
خ- بەشداریكردن و سیمیناری سیاسی .
د- خوێندنەوەی كتێبی فكری سیاسی .
ذ- دروستكردنی بازنەی گفتوگۆی سیاسی .

## چوارەم: (مومارەسەی) كاری سیاسی

ئەم خاڵانەی پێشوو باسمان كرد لە هۆشیاری سیاسی تەنها لایەنی (تیۆری) بوون بە هەموو ڕەهەندەكانیەوە، بۆیە پێویست دەكات بۆ گەشەی هۆشیاری فكری، بەكردەیی مومارەسەی كاری سیاسی بكەین، كەسێك دوای ئەم زانیارانە بە كردەیی مومارەسەی كاری سیاسی بكات زۆر سەركەوتوو دەبێت، هۆشیاری سیاسی ئەو كەسە بەتەواوی پێدەگات.

## گرنگی هۆشیاری سیاسی

لەبەر ئەوەی سیاسەت ئەمڕۆ بۆتە كارەكتەرێكی زۆر بەهێز لە ڕووداو و هەڵوێستەكان، وای لێ هاتووە كاریگەری لەسەر ڕاگەیاندن و ئابووری و شەڕ و ئاشتەوایی دروستكردووە، دەوڵەت و حزب و دام دەزگا، تادەگاتە كۆمپانیاكانیش، بەدوای ئەوەن دامودەزگای سیاسی هەبێت، بەلایەنی كەم دەزگایەكی ڕاگەیاندنیان هەبێت هەواڵ و ڕووداوی سیاسی بگوازنەوە و ڕێكلامی پێوە بكەن، خۆیانی پێ بناسێنن، ناكرێ موسڵمان لە ناو ئەم شەپۆلە سیاسیە هۆشیاری تەواوی سیاسی نەبێت، تاوەكو نەكەوێتە داوو تەڵەی سیاسەتمەدارە ماكیاڤیلییەكان. بۆیە لەبەر چەند هۆكارێك هۆشیاری سیاسی یەكجار گرنگە لەوانە:

١- كاری سیاسی ئاڵۆزترین كارە لە ژیانی مرۆڤدا، پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ هەموو بەشەكانی ژیان هەیە، سیاسەتكردن (وەزیفەیەكی) زۆر گرنگە، كاروبارو گاركێڕی و هەڵسوڕان و پەیوەندی دەرەوە و ناوەوە و هونەری ئاشتی و جەنگ و كاری سیاسین، زۆرترین هۆشیاری و كارامەیی و داهێنان و فكر و بیر و كارگێڕی و كاریزما و لێهاتووی دەوێ سیاسەت كردنیش بەبێ هۆشیاری نابێت.

٢- لە دونیای جیهانگەرایی (عەولەمە) سیاسەت بۆتە تەڵەوفێڵ و زۆرانبازی بەتایبەت زۆربەیان سیاسەتی ماكیاڤیلی پەیرەو دەكەن، بەبێ هۆشیاری سیاسی موسڵمانان دەكەوێتە نێو تەڵەی ئەوان و بەكاری دەهێنن.

٣- ئەمڕۆ لەكاری سیاسی و (معادەلەكاندا) موسڵمانان لە دواوەین، بەشێكی سەرەكی نەبوونی هۆشیاری سیاسیە، ناتوانین (واقیعەكە) وەك خۆی بخوێنینەوە و (دیراسە) و لێكۆلینەوەی لەسەر بكەین.

٤- جیهانی سیاسەت زۆر فراوانە وەك جیهانی بازرگانی وایە، بۆیە موسڵمان ئەگەر كەلوپەلەكان نەناسێتەوە نازانێ چۆن هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكات، لەكۆتاییدا دەسەلاتەكە دەدۆڕێنێ بەبێ هۆشیاری سیاسی.

٥- مامۆستایانی ئاینی ئەمڕۆ لە کوردستان بەڕێژەی حیزبێك دەبێت، پێگەیان بەحوکمی مینبەر و ئەم ئیسلامە بەرزە زۆر بەهێزە، کەچی چونکە هۆشیاری سیاسیان لاوازە ناتوانن کاریگەریان لەسەر ڕووداو و پێشهات و هەڵوەستەکان هەبێت! دەیان بڕیاری چارەنووسساز دەردەچێ، کێ پرسیان پێدەکات! جاری واهەیە لە خۆشی بپرسە دەڵێت: ئەمە کەی ڕوویداوە، هۆکارەکەی چی بوو؟ ئەی بۆ من نەم زانیوە؟ باشە چی بکەین؟

٦- نەبوونی هۆشیاری سیاسی وایکردووە بەشێك لە تاکەکانی موسڵمان بێنە نێو ئەجێندای سیاسی عەلمانیەکانەوە، لەمەش کارەساتتر زۆر لە مامۆستایانی ئایینی بەبێ ئاگایی دەبێتە بەشێك لە جێبەجێکردنی فکرەی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت (فصل الدين عن الدولة)، بەئاشکرا دەڵێت: بابە من سیاسی نیم لە سیاسەت نازانم، ئاخر برا سیاسی نەبێ، هۆشیاری سیاسەتت نەبێت لە سیاسەت نەزانی، نابێت ڕەخنە لە حکومەت بگری چونکە سیاسەتە!



نابێ باسی پەرلەمان و دەستور و یاسا و هەڵبژاردن هتد.. بکەی ئەمە سیاسەتە! تەنها بۆت هەیە وتاری ئەخلاقی، (تەلقینی) مردوو، دوعاکردن، سەرقەبران، مارەبڕین و تەڵاقدان ئەنجام بدەی! لەمە زیاتر بۆخۆت گووتوتە نابێ ئەنجامی بدەی، ئەمە بۆ؟ تەنها لەبەر نەبوونی هۆشیاری سیاسی.

٧- سیاسەت کردن و بڕیاری سیاسی خۆی بەسەر هەموو جومگەکانی ژیاندا زاڵ کردووە، خەڵکیش ئەمرۆ تەنها بە دوعا و سەرقەبران ڕازی نابێ، دەیەوێ خەڵکی دەستپاك و دڵسۆز و ئیمام کاروباری سیاسەت بگرێتە دەست ئەمەش بەبێ هۆشیاری سیاسی نابێت.

٨- چەندە هۆشیاری سیاسیت بەرزبێ ئەوەندە کار و کردەوە و بڕیارت باشتر و بەسودتر دەبێت، بەپێچەوانەکەشی هەر ڕاستە.

٩- گۆڕانکارییەکان زۆر خێرا ڕووداوی سیاسی کاریگەری لەسەر جیهان هەیە، ژیان لەم ڕووەدا پانتایی بیرکردنەوەی زیادکردووە، ئەم ڕووداوانەی لە کیشوەرێکی تر ڕوودەدات ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر ئابووری سیاسی، ڕاگەیاند

هتد...، بەبێ هۆشیاری سیاسی تر ناتوانی وتار و ڕاوبۆچونت هەتا لەسەر (مینبەر) و ڕاگەیاندنەکانی خۆشت بڵێی.

١٠- ئەم ڕێژەو داتایانەی لەژێردەستە، لەساڵی (١٩٩١) یەکەم ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستان کاردەکات لەهەر هەڵبژاردنێك ڕۆژبە ڕۆژ ساڵ بە ساڵ لە پاشەکەشەیە، ئەمەیان وەك بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر پێماندەڵێ: گرنگی نەدراوە بە هۆشیاری سیاسی.

١١- نەبوونی هۆشیاری سیاسی، پاشکۆیی، لاوازی، دواکەوتن، کەچی خودای گەورە داوای لە موسڵمان کردووە پیشەنگ بن، چاوساغی میللەتان بن.

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ﴾[1]

واتە: (بەو شێوەیەش ئێوەمان بەگەلێکی میانەڕەو گێڕاوە، لەهەموو ڕوویەکەوە، لەڕووی عیبادەت و خواپەرستیەوە، لەڕووی دنیاو قیامەتەوە، لەڕووی داخوازییەکانی ڕۆح و نەفسەوە هتد...، تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، تا بزانن ئەم ئایین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێر و سەربەرزییە بۆ تاك و کۆمەڵ لە هەموو سەردەمێکدا و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆ ئەوەی پێغەمبەریش لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستا و ڕابەری ئێوە بێت، و لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئومەتی لەسەر ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵساون).

﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ ﴾[2]

واتە: (بەڕاستی ئێوە چاکترین ئومەتێکن کە بۆ سوودی خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا دەهێنن ).

---

(١) سورەتی البقرە ئایەتی (١٤٣)

(٢) سورەتی ال عمران ئایەتی (١١٠)

١٢- خاڵی کۆتایی لە گرنگی هۆشیاری سیاسی بە وتەیەکی زۆربەرزوبەپێزی بیرمەندی ئیسلامی (موحەممەد غەزالی) دەهێنین، تەواو واتای گرنگی ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەفەرمووێت: (ان الفكر السياسي عند جهرة المتدينين يقسم بالقصور البالغ، إنهم يرون الفساد ولا يعرفون سببه، ويقرءون التاريخ ولا يكشفون عبره، وانهز منا في عصركذا، فلا يدركون سبب هذه الكسيوة)[1]

واتا: (بەڕاستی فکری سیاسی لەلای کۆمەڵی دینداران کەموکوڕیەکی زۆر تێدایە، ئەوانەن فەساد دەبینن نازانن هۆکارەکەی چیە! مێژوو دەخوێننەوە پەندی لێ وەرناگرن! دەڵێن پێشان ئێمە زۆر بەدەسەڵات و بەهێز بووین، نازانن نهێنی ئەم دەسەڵات و عیزەتە چی بووە. لە فلان سەردەم شکاین و لاواز بووین، نازانن سەبەبی کەوتنەکەی چییە).

--------------------------------

(١) (الحركة الاسلامية، رؤية مستقبلية، محمد غزالي)

## زەرەر و زیانی نەبونی هوشیاری سیاسی

بەڕاستی نەبوونی هۆشیاری سیاسی کارەساتێکی گەورەیە، چەندین زەرەر و زیانی هەیە، زۆر بەزەحمەت سنورداردەکرێت، بەکورتی هەندێکیان بۆ بەرچاوڕوونی دیاری دەکەین لەوانە:

١- نەبوونی هۆشیاری سیاسی دەبیتە هۆکاری تێنەگەیشتن لەزمانی سیاسەت و چەمك و زاراوەکانی سەردەم، وەك: جیهانگیری، عەلمانیەت، پێکدادانی شارستانیەت، توندڕەوی هتد..

٢- ناتوانێ بنەمای شەرعی و تێگەیشتن لە ئایەت و فەرموودەکان بە ڕووداوی سیاسی و سەردەمی ببەستینەوە.

٣- ناتوانێ لەگەڵ دونیا نوێگەرایی (التجدید) بڕوا، بەجێ دەمێنی لە کاروانی زانست و زانیاری بەتایبەتی لە فکری سیاسی.

٤- ناتوانێ نەخشەڕێگا بۆ داهاتوو دابنێ.

٥- خوێندنەوەی بۆ ڕووداوەکانی جیهان و ناوەخۆ لارولێر دەبێت.

٦- دەکەوێتە نێو ئەجێندای دوژمن بێ ئەوەی هەستی پێ بکەی.

٧- لەگەڵ پێشهات و ڕووداوەکان تێکگیران ڕوودەدات.

٨- لەکاتی ڕوبەروبونەوە هەر زوو ژێر دەکەوێ.

٩- ناتوانێ سود لەدەرفەت و ڕووداوەکان وەربگرێ.

١٠- دوژمنی خۆی ناناسێتەوە، جاروایە کەسێك بەدوژمنی خۆی دادەنێی لەکاتێکدا دوژمنی نییە!

١١- لەنێو گۆمەڵگە ڕۆژبەڕۆژ سەنگی دادەبەزێ.

١٢- متمانەی جەماوەر لە دەست دەدا.

١٣- نازانێ لە کێ سوود وەرگرێ و کامیان زەرەرە بۆی.

١٤- بەردەوام پێی وایە لە پێشە کەچی زۆر دواکەوتووە لە (واقیعدا).

١٥- لەکۆتایی ئەگەر جاران هۆشیاری سیاسی ئەوەندە گرنك نەبوو، چونکە سیاسەت بۆ بەرێوەبردن پێك هاتبوو لەکۆمەڵێك ئەخلاق و ڕەهەندی پەروەردەیی هتد.. ئێستا، کە وترا سیاسەت واتە: فێل، تەڵەکە، درۆکردن، چۆن خۆت دەوڵەمەند دەکەی، تەنها کورسیەکە هەبێ حوکم چۆن دەکەی بیکە، ڕون نیە ئەمانە جۆرە سیاسەت کردنە وا بە موسڵمان دەڵێت.

موسڵمان تێگەیشتن و هۆشیاری سیاسی بە حوکمی شەرعی پێویستە واتا: (واجبە). پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت:

(الْمُؤْمِنُ كَيِّسٌ فَطِنٌ حَذِرٌ وَقَّافٌ، مُتَثَبِّتٌ، عَالِمٌ وَرِعٌ، لا يَعْجَلُ)[1]

واتە: موسڵمان ژیرە، دانایە، هۆشیارە، هێواش و لەسەرخۆیە، خۆڕاگرە، زانایە، لە خواترسە، پەلە ناکات).

---

(١) نوادر الاصول امام الترمذي (ب١ - ل١٢٦) ژمارە (١٤١٨)

# تێگەیشتن لە (واقیع)

## چۆن لە (واقیع) تێبگەین ؟

بە واتایەکی تر چۆن (واقیع) و ڕووداو و پێشهاتەکان بە ڕاست و دروستی بخوێنینەوە و تێی بگەین؟ تێبگەین ئێمە لە کوێی ئەم واقیعەین؟ بۆ خۆمان لە دەستدا؟ بۆ ئێستا لەم سەرگەردانیە ئەژین؟ بۆچی ئوممەی ئیسلامی زۆر لە دواوەوەیە؟ بۆچی کاریسە و ڕووداوەکان ڕوو لە ئێمەیە و لەسەر ئێمەیە؟ بۆچی لەم پیلان و فێلانەی دوژمن ناگەین؟ لەم سەردەمەی شۆرشی زانیاری و ئینتەرنێت هێشتا هەر لە دواوەین زیاتر سەرگەردانین؟ هەریەك شیکارێکی سیاسی دەکات پێچەوانەی ئەوی تر؟ ئەم حاڵەتە بۆچی و لەبەر چی؟ لە پای چی؟ ئەمانە هەمووی پرسیارن و وەڵامیان پێویستە! ئەگەر باش حاڵی بین لە واقیعی ئێستا بەدڵنیاییەوە ئەم هەموو نەهامەتیەش لەسەرمان دووبارە نابێتەوە.

## لە کوێ دەست پێبکەین بۆ تێگەیشتن لە ( واقیع )؟

دیارە هەر زانستێك و پیشەیەك ئەساسیات و بنەماو قاعیدەی هەیە بۆ تێگەیشتن بە تەئکیدیش تێگەیشتن لە واقیع بێ ئەساس و بنەما نیە؟ سوپاس بۆ خودا قورئان ئاماژەی بەو کەسانە کردوە، کە باش لە واقیع حاڵی دەبن، دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ ﴾[1]

واتە: (هەرکاتێك هەواڵێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی، یاخود ترس و بیم، بڵاوی دەکەنەوە (بیر لە سەرئەنجام ناکەنەوە)، خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەکردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆلای پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم)، یان بۆ لای کاربەدەستانێك، کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کەلە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و لێیدەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لێ دەردەهێنا).

ئەم حاڵەتەش بێگومان جێبەجێ دەبێت لە هەموو سەردەمەکان، بۆیە لە هەموو سەردەم و کات و شوێنێك زانایان هەن لە (واقیع) تێدەگەن و شیکاری سیاسی وردیان هەیە، تێگەیشتن لە (واقیع) بەتایبەتی بۆ بیرمەند و چاکسازخواز دەبێ ئەم خاڵانەی تێدا بێت.

١- ڕۆشنبیری گشتی.

٢- پسپۆر لە زانستی تایبەت.

٣- هۆشیاری سیاسی .

٤- سوودوەرگرتن لە هەڵەکانی پێشوو .

٥- دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکان.

٦- ئاگاداربوون لە پرۆسە هاوشێوەکانی خۆی.

٧- بەدواداچونێکی بەردەوامی هەواڵ و ڕووداوەکان.

٨- خوێندنەوە .

٩- (تەخمین) کردنی پێشهاتەکان.

١٠- مومارەسەی فکری سیاسی بەکردار.

---

(١) سورەتی النساء ئایەتی (٨٣)

## هەنگاوەکانی تێگەیشتن لە ( واقیع )

ئەم ڕووداو و ناخۆشیانەی بەسەر ئومەتی ئیسلامیدا دێت زۆربەیان لە مێژوو بەسەر ئێمە دووبارە بۆتەوە. ئێستا دەکەوینەوە هەمان ڕووداوی پێشوو. چەند هەنگاوێکمان پێویستە، تا جارێکی تر نەکەوینەوە هەمان هەڵەی پێشوو لەوانە:

**یەکەم:** دەبێت ئەم ڕووداوانەی پێشوو ڕوویانداوە، بەوردی بنوسرێتەوە ئامادە بکرێت.

**دووەم:** دەبێت بکرێتە (مەنهەج)، لە خوێندنگاکان بخوێنرێت، ڕۆڵەکانمان لەسەر پەروەردە بکرێت، تا هۆشیاربن، ئاگاداربن، نەکەونەوە هەمان هەڵەی پێشوو.

**سێیەم:** پەند و ئامۆژگاری لێوەربگیرێت.

**چوارەم:** ئەگەر بە ووردی دیراسەی چۆنیەتی تێگەیشتنمان بکەین لە (واقیع)، بۆمان دەردەکەوێت کاریگەری ڕاگەیاند زۆرە لەسەر تێگەیشتنمان. کەمتر وایە بۆ خۆمان لێکۆڵینەوە و (دیراسەی) خۆمان هەبێ نابێ تەنها پشت بە ڕاگەیاندنی بەرامبەر ببەستین.

**پێنجەم:** هەر ڕاگەیاندنێك بە تایبەتی سیاسیەکان بەشێکی ڕاستیان شێواندووە، بەم شێوەیە خۆیان دەیانەوێ ئاڕاستەی دەکەن، مادەم بەشێك لە تێگەیشتن لە (واقیع) وەستاوە لەسەر ڕاگەیاندن، دەبێت وردبین و لێکۆڵینەوە بکرێت ئینجا کاری خۆتی لەسەر بینا بکەی.

**شەشەم:** خوێندنەوەی (واقیع) پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ خەڵك بژی. گۆشەگیری، بە تەنها ژیان، بۆ خۆت ژیان، ناتوانێ حاڵی کۆمەڵگە بزانێ و تێبگەی.

دەڵێن: پاشای فەرەنسا (ماری ئەنگوانت) پێش شۆڕشی فەرەنسی لە ژیانی ڕەفاهیەت و خۆشی دەژیا لە جیهانی دەرەوە تەواو گۆشەگیر ببوو، هەندێك لە کرێکارەکان لە برسان سکیان دەگوشی، هاتنە لای گوتیان: برسیمانە هەفتەیەکە

نانمان نەخواردووە، چونکە لەگەڵ خەڵك نەدەژیا و ژیانی خۆی پڕ لە ڕەفاهیەت بوو لە خشتەی مێشکیدا ئەوە نەبوو خەڵکانێك هەیە نان نییە بخوات، وەڵامی داوە وتی بۆچی (ڕێجیمی) دەکەن و نان ناخۆن هۆکاری چییە؟

**حەوتەم:** خوێندنەوەیەکی قوڵ، ئەمرۆ بەشێك لە موسڵمانان (واقیع) زۆر بەسادەیی دەخوێنەوە، بۆیە سەرەنجامێکی هەڵەمان بۆ دەردەکەوێت، خوێندنەوەی (واقیع) تێگەیشتن پێویستی بە زانیاری زۆر قوڵ هەیە، کۆمەڵگە یەك چین و توێژ نیە، بەڵکو چەند توێژێکە، بۆ هەر توێژێك خوێندنەوەیەکی دەوێ، کۆمەڵگا بەگشتی لەچەند چین و توێژی جیاواز پێکهاتووە. لە دەزگا و حیزب و توێژەکان بەیەك خوێندنەوە بخوێنرێتەوە ئەوە هەڵەیە، لە (واقیع) نەگەیشتنە.



**هەشتەم:** چەند خوێندنەوەت بەهێزبێ، (مەنهەج) و ڕێرەوت ڕێکوپێك دەبێت، سەرەنجام زۆرجار وەك ئەوە نییە، کە تۆ دەتەوێ، بۆیە دەبێ ئاگادار بیت هەڵە حاڵی نەبیت لەسەرەنجام.

**نۆیەم:** بەبێ ئاگاداربوون لە ڕووداوە ناوچەیی و نێودەوڵەتیەکان ناتوانی بەهیچ شێوەیەك (واقیع) بخوێنیەتەوە، تاوەکو لە سیاسەت و هەنگاو و ڕووداوەکانی نێودەوڵەتی و هەرێمی شارەزا بیت (واقیعت) باشتر بۆ دەخوێنرێتەوە، ئەمرۆ دونیا بۆتە گوندێك بەهۆی جیهانگەراییەوە، هەموو ڕووداوەکان کاریگەریان لەسەر یەکتر هەیە، خوێندنەوەی واقیعیش بۆ چارەسەرە، بەبێ ئاگاداری تێگەیشتنی دروست و تەواو لەسەر واقیع نایەتە بەرهەم.

**دەیەم:** شارەزای لە چەمك و زاراوەکانی سەردەم بە تایبەتی چەمك و زاراوەی سیاسی، یاسایی، ڕاگەیاندن، تێگەیشتن لەم چەمکانە بەشێکە لە تێگەیشتن لە (واقیع)، زۆر چەمك و زاراوە پەیدابووە ڕۆژانە لە دەزگا ڕاگەیاندنەکان دەگوترێت بەشێك لە موسڵمانان تائێستا هەوڵیان نەداوە لەم چەمکانە بگەن، بەبێ ئەمانە چۆن لە (واقیع) دەگەی بە تایبەتی مامۆستایانی ئایینی.

**یانزەهەم:** دەرچوون لە بازنەی زانستی شەرعی . زانستی شەرعی لە بنەڕەتدا هەموو زانستەکان دەگرێتەوە، بەڵام لەم دواییەدا لە قوتابخانە و مزگەوتەکان زانستی شەرعی سنوردارکراوە، کورتکرایەوە بۆ چەند زانستێکی (فیقهی)

سنوردار، بەمەش بەتەنها ناتوانی لە (واقیع) شارەزا بیت، بەڵکو زانستەکەت گۆشەگیر دەبێت لەم چەند زانیارییە تایبەتەیە کەلە کتێبەکەدا هەیە، بۆیە دەبێت لەم بازنەیە دەربچیت تا (واقیع) بخوێنینەوە.

**دوانزەهەم:** هەموو هەنگاوێك بە پیلان (مؤامرە) ئەزانرێت. کلتورێك هەیە بۆتە بەربەست لەرێی تێگەیشتنمان، پێمان وایە هەموو شتێك، کە ڕوودەدات لەپێشدا نەخشەی بۆ کێشراوە، تۆ تێبگەی یان نا، ئەوە سودێکی نییە! بۆیە پێویست بەخۆ سەرقاڵکردن ناکات، ئەوە کارەساتە موسڵمان وابیربکاتەوە. ڕاستە زۆر شت نەخشەی بۆ کێشراوە، بەڵام ئەوەی خودا دەیەوێ زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی پیلان و نەخشەی بۆ دارێژراوە لە سونەتی ژیان، بەردەوام هەوڵدەدات ڕاست و دروست لە بابەتەکان بگات، تا ڕووبەڕووی بێتەوە.



**سیانزەهەم:** هەموو ڕووداوێك هات یەکسەر دەڵێین: ئەوە (قیامەت) نزیك بۆتەوە، تازە تەواو دونیا کۆتایی دێت، بەم بەهانەوە وەك ئەوەی بمانەوێ لەشتەکان نەگەین، بۆ ئەوەی خۆمان ماندوو نەکەین و لە بەرپرسیارەتی دوور بکەوینەوە. پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەی، تێگەیشتنی بۆ چییە! ئەمە نیشانەی (قیامەتە) و کۆتایی دونیایە! ڕاستە خودای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی بە ڕۆژی دوایی داوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چەندین فەرموودەدا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام ئایەت و فەرموودەکان داوای ئەوە دەکەن تا باش لە (واقیع) بگەین، نەخشەڕێگا نەك تەنها بۆ دونیا بەڵکو بۆ ڕۆژی تێکچون و دوای مردنیش بکێشین، تێبگەین تا پێبگەین، ئەگەر ببینین بەیانی دونیا کۆتایی دێت، ئەوەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت:

(اذا قامت الساعة وفي يد احدكم فسيلة، فاستطاع ان يغرسها قبل ان تقوم الساعة فليغرسها)(١)

واتە: (ئەگەر ڕۆژی دوایی هات لە دەستی هەریەکێکتان نەمامێك هەبوو، ئەگەر توانی پێش ئەوەی دونیا تێکبچێت بیچێنی بابیچێنێت). ئەوە تێگەیشتنە لە (واقیع) و نەخشەڕێگایە بۆ داهاتوو.

---

(١) ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، (١٢٩٢٥) — (ب٣ - ل١٨٣)

## کۆسپ و تەگەرە و ڕێگرەکانی تێگەیشتن لە (واقیع)

بێگومان ئەم هەنگاوانە بەشێك لەم ڕێگرانە لادەدات، بەڵام بەپێویست دەزانری بەچەند خاڵێك باسی ڕێگری تێگەیشتن لە واقیع بکەین، بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی ڕێگرەکان بناسێتەوە.

### ئەوانەی لە کۆمەڵگە دەژین. چەند جۆرێکی سەرەکین:

**یەکەم:** جۆرێکیان گەیشتۆتە بێ ئومێدی، ئەمەیان نایەوێت لە (واقیع) تێبگات، شەو و ڕۆژ ئەم فەرموودانە دووبارە دەکاتەوە،

(فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّي يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ على ذَلِكَ)[١]

واتە: (پشت لەهەموو دەستە و جماعەتەکان بکە، یان دەست بە ئەصلی دارەکە بگرە تا مردن دەتگاتێ تۆ هەروا بمێنەوە). ئەم جۆرە ئەم فەرموودەیە هەڵە وەصف دەکات و بۆ خۆی کردوویەتی بە بیانوو.

**دووەم:** ئەم جۆرەیان پەیوەندی لەگەڵ دونیا بەهێزە، ئەمەیان زۆر حەزناکات لە زۆر بابەت تێبگات، تەنها ئەوانە نەبێت کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندی ئەو هەیە، جارجاریش دەڵێت: (انا رب الابل وللبيت رب يحميه)، واتە: (من خاوەنی وشترم و بەیتیش خاوەنی خۆی هەیە بیپارێزێ). زۆربەشیان نوێژ و ڕۆژووش ئەنجام دەدەن.

**سێیەم:** جۆری سێیەم سەرسامە بە سەرکەوتن و هێزی شارستانیەتی ئەوروپا، ئەم جۆرە تووشی داڕووخانی دەروونی بووە، پێیوایە تازە دونیا کەوتۆتە دەستی ئەوروپا و مەحاڵە جارێکی تر ئەم شارستانیەتە بەهێزە بگەڕێتەوە دەستی

---

(١) مسلم گێڕاویەتیەوە، (ب٣ - ل ١٤٧٥) ( ١٨٧٤)

موسڵمانان، بۆیە تێگەیشتن لە (واقیع) هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، با لەگەڵ بڕۆین باشترە خۆمان بەتەواوەتی تەسلیمی ئەورووپا بکەین.

**چوارەم:** هەستنەکردن بە بەرپرسیارەتی، ئەم جۆرەیان ئەم هەموو ڕووداو و کارەسات و کوشتن و بڕین و لە ناوبردن و منداڵ و ژن و پیر کوشتنە لەناو موسڵمانان هیچ کاری تێناکات! هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات سۆزی ناجوڵێت، دڵی ڕاناچلەکێ، چاوی ئەبڵەقە نابێ، ئەمەیان نایەوێ لە (واقیع) بگات. لە چەرخی هەژدەهەم و نۆزدەهەم موسڵمانان لە ناخۆشترین ژیاندا گوزەریان دەکرد، بەتایبەتی لەکاتی ڕووخانی دەوڵەتی ئەندەلوس. (ئەبو بەقاء رندی) سەری سوڕدەمێنێ، ئەم ڕووداوە ناخۆشانە هەیە، کە کەس هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات. بە شعرێك هەستی خۆی دەردەبڕی دەڵێت:

یـا راكبين عنـاق الخـيـل ضـامـرة — كأنها في مجـال السبق عقبـان
وحـامـلين سيوف الـهند مرهـفـة — كأنها في ظــلام النقـع نيــران
ورا لـعيـن وراء البحــر فـي دعـــة — لهـم بـأوطانهـــم عـز وسلطــان
أعـــندكم نبـــاء من أهــل أنـدلـس — فقد سرى بحديث القوم ركبـان
كم يستـغـيث بنـا المستضعفون وهـم — قتلى وأسرى فما يهـتز انســان
مـاذا التقـاطـع في الاسـلام بـينكم — وأنـتـم يـاعبـاد اللـه اخــوان
يـامــن لذلّة قـوم بـعــد عـــزّتهم — أحـال حالهم جـور وطغيــان
بـالامس كانوا ملوكـا في مــــنازلهم — واليوم هم في بلاد الكفر عبدان
فـلو تــراهـم حـيارى لا دليل لـهـم — عليهم في ثياب الـذل الــوان
يــارب أم وطـفـل حـيل بينهمــا — كمـا تـفـرّق أرواح وأبــــدان
وطفلة مثل حسن الشمس اذ طلعت — كأنما هي يـاقــوت ومرجـــان
يقـودهــا العلـج للمكــروه مكرهــة — والعين باكية والقلب حيران
لمثـــل هــذا يبكى القــلب مـن كمـد — ان كان في القلب اسلام وايمان

**پێنجەم:** بەرژەوەندی تایبەتی، بەشێك لەوانەی نایانەوێ لە (واقیع) تێبگەن بەرژەوەندی تایبەتییە، کەسەکە بەرژەوەندی لەم سیستەمە گەندەڵە هەیە، سوودی مادی لێ دەبینێت، پلەیەکی حیزبی، یان حکومی وەرگرتووە، ئەم جۆرەیان خۆی لە (واقیع) گێل دەکات حەزناکات تێبگات، تەنها ئەوەندی نەبێت کە بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی بپارێزێت .

**شەشەم:** هەڵاتن لە بەرامبەر ڕووبەڕووبونەوەی (واقیع)، ئەوانەی، کە بەردەوام بەهانە دێننەوە و (واقیعێکی) کەوتوو بەپێشکەوتوو وەصف دەکەن، دەڵێن: چ گرفتێکمان هەیە! لەوە باشتر چیمان دەوێ! لەوە زیاتر چی دەکرێت! (الحمدلله) موسڵمان زۆرن، نوێژخوێن، ڕۆژووگر زۆرن، ئەم دڵەراوکێیەی بۆ چییە! ئەمەشیان زیاتر هەڵاتنە لە بەرامبەر (واقیع)، ناتوانێ ڕووبەڕووی (واقیع) ببێتەوە، ئەگەر باس لە نەخۆش و ناخۆشی و هەژاری و ژێردەستەیی و دواکەوتنی موسڵمانان و لەناوچوون و زوڵم لێکردنیان بکەی، ئەڵێت: ئەمە زۆر لە وزە و توانای ئێمە زیاترە، پێویست ناکات بیری لێ بکەیتەوە. ئەمە تەنها بەوە دەکرێت، یان (عیسا) (سلاوی خوای گەورەی لەسەربێ) بێتە خوارێ، یان (موحەممەد مەهدی) بێت، یان کەسێکی تر، جگە لە ئێمە (مجدد) بێت، ئەگەرنا ئەمە لە توانای ئێمەدا نییە.

**حەوتەم:** خۆبەستانەوە و پەیوەستکردن بەیەك قوتابخانە و حیزب و فکر و (مەنهەج) و کەسایەتییەك. یەکێکی تر لە بەردەم تێگەیشتن لە (واقیع) خۆبەستانەوە و دەمارگیرییە بۆ بۆچوون و ڕای کەسێك، یان قوتابخانەیەك، ئەگەر کەسەکە، یان قوتابخانەکە ئاستی ئەوەندە بەرز نەبوو لە (واقیع) بگات، ئەوا والە خوارەوەی خۆی دەکات ئەوانیش بە چاوی ئەو سەیری (واقیع) بکەن. بۆیە بە هەڵە (واقیع) دەخوێنێتەوە، ئەمەش جۆرێکە لە خۆبەستانەوە و سنوردارکردنی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری.

**هەشتەم:** خۆلەبواردن لە ڕاستییەکان، خوێندنەوەی (واقیع) پێویستی بە بەدواداچون هەیە بۆ ڕووداوەکان، تا ڕاستیەکانت بۆ دەرکەوێت، ئەوەی خۆببوێرێ بۆ ئەوەی لە بەرپرسیارەتی ڕابکات ناتوانێ لە (واقیع) تێبگات .

**نۆیەم:** ژینگە و شوێنی ژیان، ژینگە و ئەم چوارچێوەی مرۆڤ تیادا دەژێت ئەگەر دۆگما و چەقبەستوو بووبێ، ناتوانی باش لەم ژینگەیە لە (واقیع) بگات. عەرەب دەڵێت: (مرۆڤ کوڕی ژینگەیە)، واتە: ژینگەکە پێشکەوتوو ژیر و دانا بێت تاکەکە وا دەردەچێت .

**دەیەم:** دەستەبژێری بیرمەند و بانگخواز و زانا و دانا، ئەم جۆرەیان جێی ئومێدە، ڕزگارکاری میللەتە، بەردەوام لە هەوڵدایە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵگە، بەڵام ئەمەش ڕێگرییان زۆر لە پێشە، بواریان بۆ نەڕەخساوە، تا ئەوەی لە بیریان دایە بیگەینن.

## ئاوڕێك لە ئازارەكان

بەشێكی زۆر لە ڕووداوەكان چەند جاری تر لەسەر موسڵمانان دووبارە بوونەتەوە، هەمان سەرەنجامی پێشووی هەبووە، دەبوو موسڵمانان لە هەموو كەس زیاتر هۆشیار بن، (لە كونێكەوە چەند جارێك پێوە نەدرێن). پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(لايلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)[١]

واتە: (موسڵمان لە كونێكەوە دووجار پێوەی نادرێ)، بەڵام بەداخەوە بەهۆی تێنەگەیشتنمان لە (واقیع) و ئاوەڕنەدانەوەمان لە ئازارەكانی ڕابردوو، پەند وەرنەگرتن لێیان، ئەمە چەندین جارە هەمان هەڵە ئەنجام دەدەین و دووبارەی دەكەینەوە. پێویستە ئاوڕێك لە ئازارەكان بدەینەوە بۆ تێگەیشتن لە (واقیع). لەم چەندین نمونەیە دەردەكەوێت لەوانە:

١- (مستەفا كەمال ئەتاتورك). دامەزرێنەری كۆماری توركیای عەلمانی لەسەرەتای كارەكانی بانگەشەی عەلمانیەتی دەرنەخست، هاوپەیمانیەتی لەگەڵ زانا و سۆفیەكان و شێخەكان بەست، بەناوی چاكسازی و گۆڕانكاری لە دەوڵەت، بەسەر پشتی خەڵكی ئایینپەروەر گەیشتە سەر تەختی حوكم! ئینجا بڕیاری لەناوبردنی خەلافەتی ئیسلامیدا[٢].

٢- نمونەیەكی تر بە هەمان شێوە لەهەمان كاتدا، (لینین) سەرۆكی حزبی شیوعی (بەلشەفی) لە ڕوسیای قەیسەر، هاوپەیمانی بەست لەگەڵ موسڵمانان لە ئۆزباكستان و دەوروبەری، پەیمانی پێدان بەوەی ئازادیان بكات لەژێر داگیركاری ڕوسیای قەیسەری، سەربەخۆی تەواویان بداتێ بەمەرجێك هاوكاریان بكەن دژی دەسەڵات. دوای سەركەوتنی بەسەر ڕوسیا بەهاوكاری

---

(١) بوخاری گێڕاویەتیەوە بەژمارە (٨٣)، وە مسلم بەژمارە(٧٦٩٠)

(٢) بروانە (الافعي اليهوديه في معاقل الاسلام)، عبدالله التل (ل ٧٥ - ٨٥)

موسڵمانان وڵاتی داگیرکرد، دەستیکرد بە کوشتن و بڕینی موسڵمانان، بە ئەندازایەك ڕوسیای قەیسەری پێشتر ئەم (وەحشی گەریەی) نەکردبوو[١].

٣- (جەمال عەبدولناسر). ئەندام بوو لە چوار شانەی حیزبی شیوعی مارکسی، گرنگترینیان حیزبی (حدتو) (الحركة الديموقراطية للتحرير الوطني) بوو، کەچی لەم کاتەدا هاوپەیمانێتی بەست لەگەڵ بەهێزترین هێزی سیاسی ئەوکاتەی میسر کە (ئیخوان موسلمین) بوو، بەهەمان شێوە پەیمانی پێدان حوکم بە قورئان بکات، ئەگەر گەیشتە دەسەڵات، بەڵام کە گەیشتە دەسەڵات دەستی کرد بە بەندکردنی موسڵمانان و لەناوبردنیان و کوشتنیان، ئەگەر (ئیخوان موسلمین) ئاوڕیان لە ڕووداوی (ئەتاتورك) و (لینین) بدابوایەوە ئەم هەڵەیان دووبارە نەدەکردەوە. بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێ ڕووداوەکانی مێژوو پشتگوێ بخرێت بێگومان خۆیان دووبارە دەکەنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی سەرەنجامەکەی ڕوون و ئاشکرایە. دەردەکە لەوەیە (ئیخوان) دەیانزانی (جەمال عەبدولناسر) ئەندامە لە شوعیەت، (حوسێن حمودە) یەکێکە لە ئەفسەرەکانی (ئەحرار). (ئیخوان موسلمین) دەڵێت: (كانت الخلية الرئيسية في تنظيم الإخوان المسلمين داخل القوات المسلحة، مكونة من سبعة ضباط هم: عبد المنعم عبد الرءوف و جمال عبد الناصر و كمال الدين حسين و سعد توفيق و خالد محي الدين و حسين حمودة و صلاح خليفة. وظلت هذه الخلية تعمل سرا طيلة أربع سنوات وأربعة أشهر بدءا من عام ١٩٤٤ حتى ١٥ مايو ١٩٤٨)[٢] واتە: (شانەی سەرەکی ریکخستنەکانی برایانی موسلمانان لەنێو هێزە چەکدارەکان بوو، ئەم شانەیە پێك هاتبوو لە حەوت ئەفسەر لەوانە : (ئەم ناوانەی لەسەرەوە هاتوە ) ئەم شانەیە مانەوە بەشاراوەیی کاریان دەکرد بۆ ماوەی چوار ساڵ و چوار مانگ، دەستی پێ کرد لەساڵی ١٩٤٤تا، ١٥ی ساڵی ١٩٤٨)

نمونەی ترمان هەیە لە بەعسیەکانی عێراق و بەشێك لە حیزبە ئیسلامیەکانی ئەم سەردەمە لە کوردستان و جیهان ئیسلامی هەمان هەڵەیان دووبارە کردۆتەوە، سوودیان لە ڕووداوەکانی ڕابردوو وەرنەگرتووە، تاوەکو لە (واقیع) تێبگەن. پێموایە ئێستاش ئەم هەڵانە هەر بەردوامن، موسڵمان چەندین جار لە یەك کون پێوە دەدرێت.

---

(١) (افكار الماركس فى الميزان) طارق حجى (ل ٦٥)

(٢) اسرار حركة الضباط الاحرار (ل ٣٣)

# خوێندنەوە بناغە و کرۆکی تێگەیشتنە لە (واقیع)

خوێندنەوە دەروازەی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە (واقیع)، ناگونجێ لە (واقیع) تێبگەی بەبێ خویندنەوە، بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان پێویستمان بە بەدواداچون و وردەکاری و هەواڵی زۆر هەیە، (شێخ حەسەن ندوی) لەم باریەوە قسەیەکی جوان دەکات دەڵێت: جیهان بێئاگا بوو لە خوێندنەوە، کاتێك قوڕئان فەرمووی (إقراء)، سەرنجی هەموو جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، لە جەزیرەی عەرەبی نەخوێندار (إقراء) مانای چیە؟ هەروەها بەپێی ئەم فەرمودەیە وەحی بە ووشەی (إقراء) دابەزیوە سێجار لەسەر یەك.

- دایکمان (عائیشە) دەفەرمویێت:

(أول ما بدئ به رسول الله (صلى الله عليه وسلم) من الوحي، الرويا الصادقة. حتى جاءه الحق وهو في غار حراء، فجاءه الملك فقال: اقرأ، قال: "ما أنا بقارئ" قال: فأخذني فغطني حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني قال: اقرأ، فقلت: "ما أنا بقارئ" فأخذني فغطني الثانية حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: اقرأ فقلت: "ما أنا بقارئ" فأخذني فغطني الثالثة ثم أرسلني فقال:

﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴾[١]

- ئەمەش ئاگاداربە (وەحی) بە وشەی (إقرأ) دەستی پێکردووە، سێجار دووبارە بۆتەوە لەدوای یەك، لە چوارەمدا ئاماژەی بە خوێندنەوە کردووە، لە ئایەتی پێنجەم خوێندنەوە و زانستی بەرامبەر کردووە. ئەم ئایەتە بەڵگەی زیندووە بۆ هەر میللەتێك بیەوێت لە (واقیع) بگات، بەبێ خوێندەنەوە ناتوانی هەنگاو بنێت، تێبگات تا پێبگات، سەردار و پێشەنگی میللەتان بێت، تا ئومەتی ئیسلامی دەیخوێندەوە لە (واقیع) دەگەیشت، سیانزە سەدە سەردار و سەرمەشقی میللەتان بوو، ئێستا کە ناخوێنتەوە دواکەوتووە و پاشکۆی میللەتانە.

---

(١) ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە

# قۆناغی پێشەنگی میللەتان

## قۆناغی پێشەنگی میللەتان بەم شێوەیە:



**١- یۆنان:** مێژووی یۆنان ڕوونە، ئەم میللەتە بە ڕێژە و ژمارە کەمە، بە خوێندن گەیشتە زانست، بە زانست لەو سەردەمەدا پیشەنگی میللەتان بوو لەهەموو دونیا.

**٢- ڕۆمەکان:** دوای یۆنانەکان ڕۆمانەکان لە ڕۆژئاوا هەر بە خوێندنەوە بوو، ماوەیەکی یەکجار زۆر ئەم پێشکەوتنەیان وەرگرت.

**٣- فارسەکان:** دوای ئەوان فارسەکان لە ڕۆژهەڵات بە خوێندنەوە پێشەنگی دونیا بوون.

**٤- موسڵمانان:** لەدوای ئەوانە موسڵمانان بوون بە ئومەتی (إقرأ)، بوون بە پێشەنگ و مامۆستای میللەتانی دونیا.

**٥- دووبارە ڕۆژئاوا:** ئێستا جارێکی تر ڕۆژئاوا دەستی کرد بەخوێندنەوە، بەم خوێندنەوەیە گەیشتن بە لوتکە، شۆڕشی زانیاری، پیشەسازی، تەکنەلۆژیای سەردەم، بە ئەندازەیەك عەقڵ تێیدا حەیرانە. ئەمەش سونەتێکی جێگیری خودای پەروەردگارە. دوای جەنگی جیهانی دووەم، خوێندنەوە لەنێو زۆربەی میللەتان بڵاوبوویەوە، گەشەی ژیان دەستی پێکردەوە، گەشەی مادی و فکری یاسایی: هەر ئومەتێك بخوێنێتەوە پێش دەکەوێت، با (کافریش) بێت، هەر

میللەتێك نەخوێنتەوە دواکەتو و پاشکۆ و هەڵوەشاوە دەبێت، با موسڵمانیش بێت، دڵنیاین میللەتانی زۆر پێش یۆنانیش هەبووە بەڵام مێژوویان ونە[١].

## زمانی ژمارەکان

بەپێویستم زانی بۆ بەرچاوڕوونی لەسەر خوێندنەوە لە جیهانی ئیسلامی، ئەم چەند ژمارەیە بخەمە بەردەستی خوێنەران، تا ترسناکی نەخوێنەوەمان بۆ دەرکەوێت.

- ڕێژەی نەخوێندەواری بەپێی ڕاپۆرتی یونسکۆ لە جیهانی ئیسلامی (٦٠) ملیۆن کەسە لە (٣٠٠) ملیۆن.

- یەك تاکی ئەوروپی بە تێکڕا لەساڵێکدا (٣٥) کتێب دەخوێنێتەوە.

- یەك تاکی ئیسڕائیلی لەساڵێکدا (٤٠) کتێب دەخوێنێتەوە.

- لە جیهانی ئیسلامی (٨٠) کەس لە ساڵێکدا بەتێکرایی خوێندنەوەی یەك کتێبی بەردەکەوێت.

- کەواتە ڕۆشنبیری کەسانی ئەوروپی بەرامبەر (٢٨٠٠) کەسی ڕۆژهەڵاتیە.

- لە ڕاپۆرتی گەشەپێدانی مرۆیی لە ساڵی (٢٠٠٣) (ل ٧٧)دا دەڵێت:
جیهانی ئیسلامی (عەرەبی) لە ساڵی (١٩٩١) (٦٥٠٠) کتێبی بەرهەم هێناوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەمریکای باکوور (١٠٢٠٠٠) کتێبی بەرهەم هێناوە[٢].

---

(١) بۆ ئەم بابەتە سوودم لە نوسراوێك وەرگرتووە لە ئینتەرنێت، بەناوی: (احوال فقه الواقع ومهارات التحليل السياسي) لە پێگەی ئەلیکترۆنی (العمق)

(٢) سودم لە نوسراوێك وەرگرتوە بە ناوی: (امه إقرأ لا تقرأ)

## چەند هەنگاوێکی گرنگ و پێویست بۆ تێگەیشتن لە (واقیع)

**ئەم هەنگاوانە زۆر سادە و ساکارن بۆ تێگەیشتن لە (واقیع)، لە هەمان کاتدا گرنگن:**

بۆ تێگەیشتن لە (واقیع) پێویستیمان بەوە هەیە جارێکی تر جۆری کەسەکان جیا بکەینەوە، لە گرتنەبەری ڕێگاکانی تێگەیشتن لە (واقیع)، هەر جۆرێك لەوانەیە بە شێوازێك دەیەوێ لە (واقیع) بگات.

**جۆری یەکەم:** دەیەوێ لە (واقیع) بگات لەڕێگای تێڕوانینی (شکلی) یان (ظاهر)ی، بەردەوام ستایشی کەسێك دەکات لەبەر ئەوەی ڕیشی درێژە، یان عەمامەکەی گەورەیە، یان جلێکی سادە (متواضع)ی لەبەردایە، لەگەڵ ئەوەی ئەمانە شتی باشن و نیشانەی پیاوچاکانن، بەڵام بەس نییە بۆ تێگەیشتن لە (واقیع) لەم ڕێگایەوە، ئەم جۆرە هەموو شتێك تێدەگات لە ڕێگەی ئەم کەسەوە، ئەم جۆرەیان نا تێگەیشتنە.

**جۆری دووەم:** ئەم جۆرەیان دەیەوێت لە ڕێگەی (مینبەر) و وتاری بریقەدار و توند لە (واقیع) بگات، تەنها لەم ڕێگایەوە (واقیع) هەڵدەسەنگێنێ، ئەویش هەڵەیە بە تەنها بۆ تێگەیشتن لە (واقیع).

**جۆری سێیەم:** ئەم جۆرەیان تەنها بەچاو سەیری کردەوەکان دەکات، گرنگی بە کردەوە دەدات و لایەنەکانی تر پشتگوێ دەخات، ئەمەش دەکرێت تووشی لادان بێت لە تێگەیشتن لە (واقیع)، بەهۆی ئەوەی زۆرجار هەندێ کەس کردەوە دەکات، بەڵام لە ژوورەوە دوو ڕووە.

**جۆری چوارەم:** ئەم جۆرەیان بۆ تێگەیشتن لە (واقیع) (تەرکیز) لەسەر هەموو لایەنەکان دەکات، نەکردار و نە گوفتار و نە فکر و نە خوێندنەوە و بەشەکانی تر پشتگوێ ناخات، جوان (واقیعەکە) دەخوێنێتەوە، ڕەهەندە ئایدیۆلۆژی و کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی هتد...، بەتەواوی دیراسە دەکات. خۆی دوور دەگرێ لەکاریگەرییە دەروونی و (عاتفیەکان)، زانستیانە هەنگاو دەنێ، ئاوڕێك لە مێژوو دەداتەوە، لایەنگیری ناکات لەبڕیاردان، (عاتیفە) و سۆز زاڵ ناکات بەسەر عەقڵ و زانستدا، لە سەرووی ئەوانەوە میزانی قورئان وسونەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) پێوەرێکی بنەڕەتییە بۆ تێگەیشتن لە (واقیع)، ئەم جۆرە زۆر سەرکەوتووترە. بۆیە خودای گەورە وەصفیان دەکات بەوەی، کە لە (واقیع) تێدەگەن دەفەرموێت:

﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ﴾ (1)

واتە: (خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاونەکردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یان بۆ لای کاربەدەستانێك کەلە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کەلە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و دەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لێ دەردەهێنا).

لەم سەردەمەدا لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بە جۆری چوارەمە، بەتایبەتی سەردەمی فێڵ و تەڵەکەی عەلمانیەکانە، موسڵمان نابێت ئەوەندە سادە و ساکار بێت فێڵی لێبکرێ، خۆشباوەڕبێ، بچێتە نێو ئەجێندای عەلمانیەکان، خۆی فریو بدات، پشت لە (واقیع) بکات، ڕاستی و ناڕاستی لێك نەکاتەوە، جیاوازی لەنێوان هەق و ناهەق، ئیسلام و عەلمانیەکان نەکات، بەسە! تاکەی ئێمە لە (واقیع) تێنەگەین لەکاتێکدا پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) نەخشەڕێگای بۆ کێشاوین، تا بزانین لە داهاتوودا درۆزن و تەڵەکەباز و عەلمانی و دووڕوو زۆر دەبن. ئەی موسوڵمان ئاگاداربە وەك دەفەرمووێت:

(سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ سَنَوَاتٌ خُدَّاعَاتٌ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ،

---

(1) سورەتی (النساء) ئایەتی (83)

وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ, وَيُخَوَّنُ فِيهَا الأَمِينُ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ. "قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ:" الرَّجُلُ التَّافِهُ يَنْطِقُ فِي أَمْرِ الْعَامَةِ)[١].

واته: (ڕۆژگارێك بەسەر خەڵك دادێت، ساڵانێكی پڕ لە فێڵ و تەڵەكە، درۆزنەكان بە ڕاستگۆ دادەنرێن، ڕاستگۆكان بە درۆزن دادەنرێن، خیانەتكار بە ئەمیندار دادەنرێت، ئەمیندار بە خائین دادەنرێت، روبیزە قسە لە هەموو شتێك دەكات، وتیان روبیزە چیە؟ فەرمووی پیاوی هیچ و پوچ و بێنرخ لە كاروباری گشتی قسەدەكات).

جا ئومەتێك ئەمە حاڵی بێت، درۆزن بە ڕاستگۆ دابنێت، خائین بە ئەمین دابنێت، دەبێ حاڵی چی بێت، چۆن لە (واقیع) تێبگات!

## چەند هەنگاوێكی گرنگ

**لە دوای ئەم جۆرانە پێویست دەكات ئەم هەنگاوانە ڕەچاو بكەین بۆ تێگیشتن لە (واقیع):**

١- میللەت بە شێوازە گشتیەكەی لەبەر بەهێزی لایەنی سۆزو عاتیفەكەی ناتوانی واقیع بخوینێتەوە، پێویستی بەدەستگر هەیە چاوساغی بێت .

٢- بیرمەند لەكاتی خوێندنەوەی (واقیع) پێویستی بە تەنها بوون هەیە، تاوەكو بیر و هزری ئارام بێت، خوای گەورە ئاماژە بەوە دەكات:

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ ﴾[٢]

بەشێوازێكی گشتی بوونی زۆرینەی خەڵك لە دەوروبەری بیرمەند ناتوانێت لە (واقیع) بگات، لەبەر سۆز و (عاتیفە).

---

(١) (ئیبن ماجة) گێڕاویەتیەوە بە ژمارە: (٤٠٣٦) هەروەها (ئیمام ئەحمەد) بە ژمارە: (٢٩١/٢)

(٢) سورەتی سبأ ئایەتی (٤٦)

٣- دەزگاکانی ڕاگەیاندن زۆربەیان کاریگەری جولەکەیان لەسەرە، بێگومان کاریگەری ڕاگەیاندن یەکجار زۆرە بەسەر تاکەکان و تێگەیشتن لە (واقیع)، زۆرێك لە مامۆستای زانکۆ و وتاربێژ و سیاسەتمەدار و کەسایەتی گەورە کاریگەری دەزگاکانی ڕاگەیاندن کاری تێکردوون، بەهەڵە حاڵی دەبن لە (واقیع)، هۆکارەکەش زۆر دووبارەکردنەوە و گرنگی پێدانە، ئەم دوو هۆکارە کاریگەری سحری هەیە، دیارە ئەمەش ئەوە ناگەینێت دەزگای ڕاگەیاندن خاڵی بێت لە ڕاستی، ئەم بۆچوونە هەڵەیە، بەڵام بە تەنها لە ڕێگای ڕاگەیاندنەوە (واقیع) بخوێنیتەوە زۆر جار هەڵە دەردەچێت.



٤- بەگومانەوە تەماشای ڕووداوەکان بکرێت، تا زۆر تەئکیدی لەسەر دەکەیتەوە. نەبوونی گومان لەسەر هەواڵ و ڕووداوەکان پشێویەکی زۆری لەنێو کۆمەڵگە دروست کردووە، دەیان کاری موسڵمانانی پەکخستوە، پێوەی خەریك دەبن، بێ ئەوەی تەئکیدی لێ بکەنەوە دواتر دەردەچێ درۆیە.

٥- بڕیاردان لەسەر دەوڵەت، حیزب، دەزگا، ڕێکخراو، کەسەکان، دەبێت لەسەر هەڵسەنگاندنی ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕ بێت، نەك لەسەر شتی لاوەکی، هەڵسەنگاندنی کاروباری سیاسی تێگەیشتن لە (واقیع)، پێویستی بەناسینی بەرامبەرەکان هەیە، لە حیزب و ڕێکخراو و دەزگاکان، بۆ ئەوەی بزانن چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن، لە مێژوو و ئایدۆلۆژیا و فەرهەنگیان شارەزابن. لە کۆتاییدا هەر کەسێك لەم بنەما و بناغە و یاسایانەی باسمان کرد شارەزا بێت بەوردی پەیڕەوی بکات، دەتوانێت باش (واقیع) بخوێنێتەوە، تێبگات، چارەسەری بۆ دابنێت. دیارە تێگیشتن لە (واقیع) لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، لە ژینگەیەکەوە بۆژینگەیەکی تر، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، جیاوازی هەیە، بەڵام خاڵی هاوبەش، بنەمای سەرەکی یاسای گونجان و بۆ تێگیشتن لە (واقیع) لە نێوانیاندا هەیە، بۆیە تیگەیشتن لە (واقیعمان) بەخاڵ باسکرد، تا زۆر بە ئاسانی تێبگەین و خاڵ بەخاڵ ڕەچاوی بکەین تا چیتر دەستمان نەسوتێ، لە کونێکەوە دەیان جار پێوەنەدرێین، دواکەوتو و پاشکۆ نەبین، هەرکات لە ڕاستی ڕووداوەکان گەیشتین ئەوا چارەسە، داهێنان، نوێکاری، سەرکەوتن، پێشەنگی زۆر ئاسانە.

## سونەتەكانی خوداو و تێگەیشتن لە (واقیع)

بۆ تێگیشتن لە (واقیع) پێویست دەكات شارەزایی و ئاشناییمان هەبێت بە سوننەتەكانی خودا، بۆ ئەوەی لەكاتی ڕووداوە ناخۆشەكان تووشی شۆك نەبین، بە ئاسایی وەری بگرین و خوێندنەوەی بۆ بكەین، دیارە هەر ڕووداوێك ڕوودەدات بەپێی سوننەتەكانی خوداییە، گۆڕانی بەسەردا نایات و جێگرەوەی نییە، بەپێی ئاماژە جوانەكانی قورئان ئەم ڕووداوانە نەگۆڕن، دەبێ ڕووبدەن لەسەر تاك بێت، یان كۆمەڵگە. سەرەنجامەكەی چۆن بڕیار درابێ دەبێت بەپێی ئەم سوننەتە خوداییە بێت. لە ئەنجامی ڕووداوەكان خودا زوڵم لەكەس ناكات:

﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا﴾[1]

واتە:(خودا ستەم لەهیچ تاكێك ناكات). سونەتی خودایی سیستەمێكی وردی ژیانە، لادەر و لاگیری هیچ تاك و كۆمەڵگەیەك نییە، بەڵكو بەپێی كردارە، وەك سونەتەكانی گەردوون وایە. ئەوەی ئەمرۆ بەسەر ئومەتی ئیسلامیمان دادێ لە نەهامەتی و كارەساتەكان، وەك خواردنێكمان لێهاتووە هەموو جیهان دەورەی لێ داوین، بەهۆی تێنەگەیشتنمان لە سونەتە خوداییەكان، ئەوەی بیەوێ سەركەوێ بەبێ تێگەیشتن لە یاساو سونەتە خوداییەكان ئەوە نەزانە، هەنگاوەكانیشی تەنها بۆ دواوە دەڕۆن. سونەتی خودایی ڕێی بنیاتنان و سەركەوتن و ئاسایش و خۆشبەختی و ئاسودەیی نیشان دەدا، سونەتی خودایی ڕێی نەهامەتی و ژێركەوتن و ناخۆشی كارەساتەكانمان پێ نیشاندەدا. چەندین میللەت سەركەوتن و ژێركەوتنیان بینیوە هەمووی لەسوننەتی خودایی تۆماركراوە:

﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾[2]

واتە:(مەگەر خوا نازانێت كێی دروست كردووەو چۆنی دروست كردووە، لەكاتێكدا ئەو زاتە وردكارو بە سۆزو ئاگایە).

---

١سورەتی الكهف ئایەتی (٤٩)

(٢) سورەتی الملك ئایەتی (٤١)

# مەبەست چییە لە سونەتی خودایی

سونەتی خودایی ئەم یاسایە دیاری کراوانەیە، کە لەلایەن خوداوە بۆ بەندەکان بڕیاردراوە، بەشێوەیەکی یاسایی، نەگۆڕ، گشتی، جێبەجێ دەبن لەژیانی مرۆڤدا.

**(دکتۆر عەبدولکەریم زێدان) دەڵێت:** (وسنة الله هي: الطريقة المتبعة في معاملة الله تعالى للبشر، بناء على سلوكهم وأفعالهم، وموقفهم من شرع الله وأنبيائه وما يترتب على ذلك من نتائج في الدنيا والأخرة )[1]

واتە: (سوننەتی خودا ئەم ریگاو یاسا دیاری کراوەی خودای گەورەیە بۆ هەڵس و کەوت لەگەڵ مرۆڤەکان، ئەمەشیان بیناکراوە لەسەر سلوك و کردەوەکانیان، هەروەها هەڵوێستیان لەبارەی شەریعەتی خوداو و ڕێڕەوی پێغەمبەرانی خودا، هەروەها ئەوەی لەم دەر ئەنجامانە سەرچاوە دەگرێت لەدونیاو دوارۆژ.

## جۆرەکانی سونەتی خودایی

خودای گەورە یاسایەکی ڕێکوپێك و تەواوی داناوە بۆ ژیان، ئەم یاسایەش گشتیە، لە ئاسمانەوە بگرە تا دەگاتە ڕێسمان، مانگ و خۆر، ئەستێرە و هەسارەکان، باران و بەفر، شەو و ڕۆژ، هاوین و زستان، ژیان و مردن. گشتیان بەپێی یاسایەکی بڕیاردراو دەڕۆن بەڕێوە:

﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾[2]

---

(١) السنن الالهية في الامم والجماعات والافراد، د. عبدالكريم زيدان (ل ١٠)

(٢) سورەتی یس ئایەتی (٤٠)

واتە: (نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات، لە هێڵ و ڕێڕەوی خۆی دەربچێت، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بەئاسانی دەسوڕێنەوە).

**جگە لەوانە چەند سونەتێکی تر هەن لەوانە:**

١- سونەتی خودایی تایبەت بە تاکەکان .
٢- سونەتی خودایی تایبەت بە میللەتان .
٣- سونەتی خودایی تایبەت بە موسڵمانان .
٤- سونەتی خودایی تایبەت بە کافران .
٥- سونەتی خودایی تایبەت بە شتە نەگۆڕەکان .
٦- سونەتی خودایی تایبەت بە شتە گۆڕاوەکان .
٧- سونەتی خودایی تایبەت بە سەرکەوتن .
٨- سونەتی خودایی تایبەت بە ژێرکەوتن .
٩- سونەتی خودایی تایبەت بە بەختەوەری .
١٠- سونەتی خودایی تایبەت بە نەهامەتی و ناخۆشی .
١١- سونەتی خودایی تایبەت بە شکۆ و سەربەرزی .
١٢- سونەتی خودایی تایبەت بە سوك و ڕیسوا بوون .
١٣- سونەتی خودایی تایبەت بە پێشکەوتن .
١٤- سونەتی خودایی تایبەت بە دواکەوتن .
١٥- سونەتی خودایی تایبەت بە بەهێزبوون .
١٦- سونەتی خودایی تایبەت بە لاوازبوون .
١٧- سونەتی خودایی تایبەت بە کۆمەڵایەتی .
١٨- سونەتی خودایی تایبەت بە بەردەوامی ژیان .
١٩- سونەتی خودایی تایبەت بە شتە ماددییەکان .
٢٠- سونەتی خودایی تایبەت بە شتە (مەعنویەکان) .
٢١- سونەتی خودایی تایبەت بە ستەمکاران .

٢٢- سونەتی خودایی تایبەت بە دادوەران .
٢٣- سونەتی خودایی تایبەت بە گۆڕانکارییەکان .
٢٤- سونەتی خودایی تایبەت بە ژیارییەکان .
٢٥- سونەتی خودایی تایبەت بە دەستاودەستی دەسەڵات .

لەگەڵ چەندین یاسا و سونەتی تری ژیان، هەموویان بەپێی ڕێڕەوێکی دیاریکراو سیستەمی بۆ دیاریکراوە، گۆڕان و جێگرەوەی نییە، گوێی پێنەدانی دەرەنجامی هەڵەت بۆ دیاری دەکات:

﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا﴾(١)

واتە:( ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن ).

بۆ جوانتر تێگەیشتن لە سوننەتی خودایی و یاساکان، گەڕانەوەیە بۆ قورئان. خودای گەورە کاتێك دەیەوێت بەندەکانی لە سونەتی خودایی تێبگەن، بۆیان ڕوون دەکاتەوە دەفەرموێت:

﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾(٢)

واتە: (بێگومان خوا دەیەوێت بەم شێوەیە هەموو شتێکتان بۆ ڕوون بکاتەوە و ڕێنموییتان بکات بۆ ئەو یاسا و بەرنامانەی پێش خۆتان).

---

(١) سورەتی (فاطر) ئایەتی (٤٣)

(٢) سورەتی (النساء) ئایەتی (٢٦)

## واتای سونەتی خودایی لە قورئاندا

وشەی سوننەت چەند جارێك بە چەند واتایەکی جیاواز لە قورئاندا هاتووە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە تا ئاماژەی پێ بدرێ چەند ئایەتێك وەك بەرچاو ڕوونی لە بابەتە جیاجیاکانی سوننەتی خودایی بهێنرێتەوە، بۆ ئەوەی ڕوونتر جۆروشێوازی یاساکانی سوننەتی خودایمان بۆ دەربکەوێ لەوانە:

### ئەو سوننەتانەی پەیوەندییان زیاتر بە ژیانی دونیاوەیە

### ١- سونەنە کەونیەکانی بونەوەر، گەردون:

﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ (ئەنجامەکەی) وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾[1]

واتە: (نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات، لە هێڵ و ڕێڕەوی خۆی دەربچێت، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بە ئاسانی دەسوڕێنەوە).

### ٢- سونەتە خوداییەکان لەبارەی بەردەوامی ژیان لە ڕێگەی نێر و مێ:

﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا (ئەنجامەکەی) مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴾[2]

### ٣- سونەتی سەر کەوتن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ (ئەنجامەکەی) يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴾[3]

---

(١) سورەتی (یس) ئایەتی (٤٠)

(٢) سورەتی (یس) ئایەتی (٣٦)

(٣) سورەتی (محمد) ئایەتی (٧)

٤- سونەتی هەوڵ و کۆشش:

﴿ وَمَن جَٰهَدَ (ئەنجامەکەی) فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ ﴾(١)

٥-سونەتی جیاکردنەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ (ئەنجامەکەی) يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴾(٢)

٦-سونەتی مانەوەی هەق و لە ناچوونی ناهەق:

﴿ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ (ئەنجامەکەی) فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ (ئەنجامەکەی) فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾(٣)

ئەم سونەتانەی زیاتر پەیوەندیان بە دونیاو بەدوارۆژەوە هەیە:

١- ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي (ئەنجامەکەی) فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴾(٤)

٢- ﴿ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ (ئەنجامەکەی) أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾(٥)

٣- ﴿ وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ ﴾(٦)

---

(١) سورەتی (العنكبوت) ئایەتی (٦)

(٢) سورەتی (الأنفال) ئایەتی (٢٩)

(٣) سورەتی (الرعد) ئایەتی (١٧)

(٤) سورەتی (طه) ئایەتی (١٢٤)

(٥) سورەتی (الروم) ئایەتی (١٠)

(٦) سورەتی (الزخرف) ئایەتی (٣٦)

**٤- سونەتی سزای گۆڕینی نیعمەت:**

﴿وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ (ئەنجامەکەی) فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾[1]

**٥- سونەتی چارەنوسی فێڵ بازان:**

﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ (ئەنجامەکەی) إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾[2]

**٦- سونەتی چی بچێنی هەر ئەوەی دەدوریەوە:**

﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ (ئەنجامەکەی) أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ (ئەنجامەکەی) فَلَهَا﴾[3]

**٧- سونەتی کردەوەی چاک و خراپ:**

﴿مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا (ئەنجامەکەی) فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ (ئەنجامەکەی) فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾[4]

**٨- سونەتی لەناو چونی میللەتان بە هۆی کردەوەی خراپی خۆیان، لە بارەی میللەتانی پێشو دەفەرمووێت:**

﴿أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ (ئەنجامەکەی) فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾[5]

---

(١) سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١١)

(٢) سورەتی (فاطر) ئایەتی (٤٣)

(٣) سورەتی (الإسراء) ئایەتی (٧)

(٤) سورەتی (فصلت) ئایەتی (٤٦)

(٥) سورەتی (التوبە) ئایەتی (٧٠)

## گرنگی لێکۆڵینەوەلە سونەتە خوداییەکان

### ا- زانینی سونەتەکانی خودا (واجبێکی شەرعیە):

خودای گەورە قورئانی بۆ ئێمە دابەزاندووە کۆتا پەیامی خودایە، بە ڕوونی باسی حاڵ و باڵی مرۆڤایەتی کردووە، بەپێی یاسایەکی سونەتی خودایی بەسەرهاتی میللەتانی بەدرێژی باسکردووە، چیان کردووە، باوەڕ و بێ باوەڕیان، زانست و نەزانیان، سەرکەوتن و ژێرکەوتنیان، بەهێز و بێ هێزیان، سەربەرزی و سوك و ڕیسوا بوونیان، مێژوو ستەم و دادوەرییان، گشتیان ڕوون کراوەتەوە. باسی ئاسمان، زەوی، مرۆڤەکان، گەردوون، دار، درەخت، دەریا و چیاکان هتد.. کردووە، داوای کردووە بیری لی بکەنەوە، تێی بڕوانن، عەقڵ و دانایی لێ وەرگرن، ئاگادارمان دەکاتەوە کە دروستکراوەکانی خودا سونەتیان هەیە، لە سەرمان پێویستە ئەم سونەتانە بزانین، بیاننوسینەوە فێریان ببین وەك زانستەکانی تر.

### ٢- فێری مێژوومان دەکات، ڕووداوەکانمان بۆ شیکار دەکات.

لە ئەنجامی دیراسەی سونەتەکانی خودا لە مێژوو دەگەین بە شێوازێکی دروست، ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەینەوە، نەخشە بۆ داهاتوو دەکێشین، جێگەی داخە ئەمڕۆ زۆربەمان دەرەنجامەکان نابەستینەوە بە هۆکارەکان، خودای گەورە بەپێی کاروکردەوەی مرۆڤەکان چەندین بەهێزی بێ هێز کردووە، دەوڵەمەندی هەژار کردووە، سەربەرزی ڕیسوارکردووە، لەش ساغی نەخۆش کردووە، ستەمکاری لە ناوبردووە:

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴾[1]

-----------------------------

(١) سورەتی (الإسراء) ئایەتی (١٦)

واتە: (کاتێك بمانەوێت دانیشتوانی شارو شارۆچکەیەك لەناو ببەین، ئەوە سەرەتا فەرمانی گوێڕایەڵی دەدەین بە دەوڵەمەندەکان (کە گوێ بەحەرام و حەڵاڵ نادەن، کە چاکەو چاکەکاری بکەن) کەچی ئەوان یاخی دەبن و خراپەکاری دەکەن لە شارەکەدا، ئەوسا ئیتر شایستەی ئەوە دەبن، کە بڕیاری ئێمە بەسەریاندا بسەپێنرێت، ئینجا ئێمەش کاولی دەکەین بەسەر یەکداو داروبەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵین).



بە پێچەوانەش، ئەگەر بە پێی یاساو سونەتەی خودایی ڕۆیشتن و کاریان کردبێ ئەوا ژیانێکی پڕ لە سەربەرزی، خۆشگوزەرانی، ئاسودەیی، ئاسایش، هێز و دانایی، داونەتێ. وەك لەم یاسایەدا دەفەرموێت:

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾[(١)]

واتە: (خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕو بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان، کە پەیام و پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆزانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن).

---

(١) سورەتی (الأعراف) ئایەتی (٩٦)

## تایبەتمەندیەکانی سونەنی خودای

**١- نەگۆڕە:** واتە نەدەگۆڕێ و نە لەجێ دادەنرێت، ئەم یاسایە نەگۆڕە وەك یاسای بیرکاری وایە، دەرەنجامێکی نەگۆڕی هەیە، چۆن دەڵێی: (١+١=٢)، بەهەمان شێوە یاسای خودایی دەستگرتنە بە ڕێڕەو و هۆکارەکانی دەرەنجامی ڕاست و دروست دەداتێ. ئەم یاسا و سونەتەیە (تەحەکوم) بە جوڵەی گەردوون و ژیان دەکات، (تەحەکوم) بە جوڵەی مێژوو دەکات، گۆڕانکارییەکانی گەردوون ڕێك دەخات:

﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا﴾[١]

**٢- گشتییە:** واتە (شمولی) هەموو دروستکراوەکان دەکات بەبێ جیاوازی، دوور لە لاگیری. خودای گەورە دەفەرموویت:

﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾[٢]

واتە: (پاداشت و ڕێز و نرخ نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی ئەهلی کتاب، ئەوەی خراپە و گوناهێك بکات، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت، جگەلە خوا پشتگیری بکات و یارمەتی بدات. ئەم سونەتە گشتییە بەسەر هەموو مروڤایەتی جێبەجێ دەبێت، تایبەت نییە بەتاك و کۆمەڵگە و میللەتێك.

خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:

---

(١) سورەتی (فاطر) ئایەتی (٤٣)

(٢) سورەتی (النساء) ئایەتی (١٢٣)

﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾[1]

واته: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: كە من یەكەم پێغەمبەر و تازەپەیدابوو نیم، ناشزانم چیم بەسەردێت، چیش بەسەر ئێوە دێت، چونكە غەیب زان نیم و لە نهێنی و شاراوەكان ئاگادار نیم، من تەنها شوێنی ئەو وەحی و نیگایە دەكەوم، كە پێم دەگات، من تەنها بێداركەرەوەیەكی ئاشكرام).



وە هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وێنەی ئەم جۆرە نەخشەیەی بۆ كێشاوین بۆ داهاتوو دەفەرمووێت:

(حملت شرار هذه الأمة، على سنن الذين من قبلهم اهل الكتاب حذو القذة بالقذة)[2]

واته: (خراپترین خراپەكارانی ئەم ئومەتە لەسەر سونەتی خراپی ئومەتانی پێشوو دەڕۆن هاوتا و پوش بە پوش).

**٣- دوبارە بونەوە لە هەمووكات و شوێنێك:** سونەنی خودایی لە هیچ سەردەم و كاتێك ڕاناوەستێ و دواناخرێ، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴾[3]

واته: (بەڕاستی پێش ئێوە چەندین یاسا و بەرنامە تێپەڕیوە لەلایەن خواوە، كە سەرئەنجام ئیماندارانی سەرخستووە و كافرانی لەناو بردووە، دە ئێوەش بە زەویدا بگەڕێن و تەماشا بكەن و ئینجا سەرنج بدەن و ورد ببنەوە، بزانن: سەرئەنجامی ئەوانە چۆن بووە، كە بەرنامەی پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە).

---

(١) سورەتی (الأحقاف) ئایەتی (٩)

(٢) ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە

(٣) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٣٧)

## سونەتی خودایی و موسڵمانانی ئەمڕۆ

دیسان دەڵێین: بە داخەوە ئەمڕۆ ئاوڕ لە زۆر بنەمای لێکۆڵینەوەی دونیایی دەدرێتەوە، دوور لە سونەتە نەگۆڕەکانی بونەوەر، لەکاتێکدا ڕۆشنایی، پێشکەوتن، دانایی، نوێکاری، بنەماکانی بەستراوەتەوە بە دەستگرتن بە سونەتە خوداییەکان، بەسەرهاتی (٢٥) پێغەمبەر (سڵاوی خودایان لەسەربێ)، بەسەرهاتی ئەم هەموو میللەتە لەگەڵ ستەمکار و ستەملێکراوەکان، هەمووی بۆ دیاریکردنی ڕێڕەوی ژیانە، بۆ پەند و ئامۆژگاری و سوود لێوەرگرتنیانە، تا ژیان ڕۆشنا بێ، مرۆڤەکان مافی خۆیان وەرگرن، سیانزە سەدەیە موسڵمانان لەسەربەرزی و کامەرانی و دەسەڵات و دادگەری و بەختەوەریدا دەژیان بە گەڕانەوە و تێگەیشتن لە سونەتەکە گەردوونیەکان، ئینجا لە (واقیع). ئێستاکە نەخشەمان نییە بۆ داهاتووی خۆمان، نازانین چۆن جارێکی تر بەجوانی خۆمان لەم موعادەلەیە ببینینەوە، بێهێزی خۆمان چارەسەر بکەین، برینی خۆمان سارێژ بکەین، دەردی میللەتمان تیمار بکەین، لە هەموو دەرگایەك دەدەین، یەخەی ئیسلام دەگرین، هەروەك ئەوەی ئیسلام بوبێتە هۆکاری دواکەوتنمان! لە بری ئەوە با لە (واقیع) تێبگەین بە گەڕانەوەمان بۆ سونەتە گەردوونیەکان، سونەتی سەرکەوتن و ژیان و شارستانیەتی ئەم میللەتانەی لە پێشدا جڵەوی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، دادوەر بوون، لە (واقیع) گەیشتوون دەرئەنجامی باشیان دەستکەوتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾[1]

واتە: (ئایا دەریشنەکەوت بۆ ئەوانەی دێن بەدوای دەستە و چینەکانی پێش خۆیان، پاش لەناوچوونی ئەوانەی کە تیایدا نیشتەجێ بوون، کە ئەگەر

-----

(١) سورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٠٠)

بمانویستایە، ئەوە بەهۆی گوناهەکانیانەوە توشمان دەکردن، وەك چۆن خەڵکانی پێش خۆیانمان لە ناوبرد و مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن).

## هۆکارەکانی شارەزا نەبوون لە سونەتە خوداییەکان

### چەند هۆکارێك هەن بۆ شارەزا نەبوونی خەڵك یان نەزانینی سونەتەکان بە کورتی ئاماژەیان پێدەکەین:



**١- بێئاگایی:** کەسانێك بێ ئاگان لە قورئان و وردبوونەوەیان لە واتاکانی، نازانن، کە سونەتەکان جێگیرن و هەموو کاتێك دووبارە دەبنەوە، بۆیە دیراسەی ناکەن.

**٢-پەلە کردن لە دەرئەنجام:** یاساکانی سونەت بە سروشت وان، دەرئەنجامیان درنگ دەردەکەوێت، مرۆڤیش بەپەلەیە لە دەرئەنجام، بۆیە بڕوای پێ لاوازە. بەنمونە، زۆرداران کاتی زۆر دەخایەنێ تاوەکو لەناو دەچن. لەوانەیە تۆ نەیبینی. (فیرعەون) و (قارون) و (نەمرود) و (ئەبوجەهل) و (سەدام حوسێن) و (موعەمەر قەزافی) و (حوسنی مبارك) و هتد...، کاتێکی زۆری ویست تاوکو لەناوچوون. بەڵام، لەکۆتاییدا هەر لەژێر یاسا و سونەتی خودایی دابوو[1].

---

(١) بۆ ئەم بابەتە سودم لە وتارێکی (شێخ سەلمان بن فەهد عودە) وەرگرتووە بەناوی (مطارق السنن الالهية) هەروەها وتاری (شێخ ئەبو مەریم موحەممەد جریتلی) بینیوە بەناوی (السنن الالية وأثرها في فهم الواقع).

# ئیسلام، بیرو باوەر، سیستەم و بەرنامەی ژیان

دوای ئەوەی گوزەریٚکمان کرد لەسەر فکری ئیسلامی و بیردۆز و تیۆرەکانی هاوردەی سەردەم، کاتی ئەوە هاتووە بە وردی باسی ئیسلام بکەین، وەك سیستەم و بەرنامەی ژیان، جیاوازی وردی نیٚوان ئیسلام وەك ئاییندراری (تدين) لەگەڵ ئایین وەك بیروباوەڕ و بەرنامەی ژیان ڕوون بکەینەوە، بەر لەوەی بچینە سەر پیٚناسەی ئیسلام، پیٚناسەی ئایین و ئایینداری (تدين) دەکەین.

## تدين چی یە؟

مرۆڤ وەك پیٚکهاتە لەچەند غەریزەیەك پیٚکهاتووە، هەر غەریزەیەکیش بەشیٚکە لە پیٚویستیەکانی لاشەی مرۆڤ، پیٚویستی بە پڕکردنەوە هەیە، مرۆڤ هیٚزیٚکی زیندووی هەیە بۆ ئەوەی بەکارەکانی خۆی هەڵسیٚ، ئەم هیٚزە دوو جۆری جیاوازە .

**جۆری یەکەم:** دەبیٚ مروڤ پڕی بکاتەوە، ئەگەرنا لەناودەچیٚ و دەمریٚ، وەك خواردن و خواردنەوە و پیٚداویستەکانی تر.

**جۆری دووەم:** پیٚویستی بە تیٚرکردن هەیە، بەڵام ئەگەر تیٚری نەکات نامریٚ، بەڵام بیٚگومان توشی دڵەڕاوکیٚ و ناڕەحەتی دەبیٚت، کەواتە (تدين) شتیٚکی فیتریە لە لاشەی مرۆڤ، (شیٚخ موحەممەد ئیسماعیل) پیٚناسەی (تدين) دەکات دەڵیٚت: (والتدين غريزة طبيعية ثابتة، إذ هو الشعور بالحاجة إلى الخالق المدبر بغض النظر عن تفسير هذا الخالق المدبر. وهذا الشعور فطري يكون في الانسان من حيث هو إنسان، سواء أكان مؤمنا بوجود الخالق، أو كافرا به مؤمنا بالمادة أو الطبيعة، ووجود هذا الشعور في الانسان حتمي، لأنه يخلق معه ويكون

جزءا من تكوينه، ولايمكن أن يخلو منه، أو ينفصل عنه، وهذا هو التدين)[١].

واتە: (تدين غەریزەیەکی سروشتی جێگیرە، هەست پێکردنە بە دروستکاری و هەڵسوڕێنەر و بەڕێوەبەرێك، بەچاوپۆشی لە تەفسیرکردنی ئەم دروستکار و بەڕێوەبەرە، ئەم هەستکردنەش شتێکی فیتریە لەناخی گشت مرۆڤەکان هەیە مادەم مرۆڤ بن، ئینجا وەك یەکە، ئەم مرۆڤە موسڵمان بێ و بڕوای بە بوونی خودا هەبێ یاخود کافر بێت، بڕوای بە مادده بێ یان بەسروشت، بوونی ئەم شعورەش لە مرۆڤ شتێکی چەسپاوە، لەبەر ئەوەی ئەم غەریزەیە لەگەڵی دروست بووە، بۆتە بەشێك لەدروستبوونی، ناگونجێ لەگەڵیدا نەبێت، یان لێی جیابکرێتەوە، ئەمەیە تدين).

ئەم (غەریزەیە) چەندین پرسیاری فکری و فەلسەفی دروست دەکات لە مێشکی مرۆڤەکان، لە کوێ هاتووین؟ چۆن بووین؟ لەکوێ ژیان دەستی پێکرد؟، ئەم بوونەوەرە بۆچی؟ چۆن دروستکراوە؟ تا دەگاتە ڕاستی خودا بدۆزیتەوە. خودای گەوەرە دەفەرموویێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[٢]

ئەگەر خودای ڕاستەقینە نەدۆزیەوە لە ڕێگەی پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لەسەر بێ)، ئەوا بەم غەریزەیە پەنا دەباتە بەر بەپیرۆز گرتن و پەرستنی

---

(١) الفكر الاسلامي، محمد محمد اسماعيل .

(٢) سورەتی (الأنعام) ئایەتی (٧٤ - ٧٩)

خۆر، مانگ، ئەستێرەکان، ئاگر، بت پەرستی هتد...، هیچ کەسێك و میللەت و ئومەتێك نابینی لە دونیا تەنها شتێکی بە پیرۆز گرتووە و دەی پەرستێ، ئەگەر زۆریشیان لێکرابێت دەستیان لە غەریزەی تەدەیون هەڵنەگرتووە، چونکە فیترەتە، لادان لە فیترەتی ئاسایی و سروشتی خۆت زۆر ئەستەمە، بۆیە زانایان دەڵێن: بێبڕوایی زۆر ئەستەم و ناخۆشترە لە ئیمان هێنان! چونکە بێباوەڕی پێچەوانەی فیترەتە، ئیمان هاوتایەتی. خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1]



واتە: (ئەی ئینسان بەدڵێکی پاك و بێگەردەوە ڕوو بکەرە بەرنامەو ئاینی خواو ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن، کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە، واتە قوڕئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نیە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن).

## ئــایین چیە؟

بەوردی لە پێناسەی ئایین بکۆڵینەوە لە ڕووی زمانەوانییەوە چەندین مانا هەڵدەگرێت، (دکتۆر موحەممەد عەبدوڵلا دراز) لەگەڵ (دکتۆر یوسف قەرضاوی) لە سێ واتادا کۆیان کردۆتەوە، لە مانادا لێك نزیکن و جیاوازیەکی کەمیان هەیە.

١- (الدین) جارێکیان بەکرداری تێپەڕ هاتووە دەبێتە (دانە، یدینە) جارێکیان بەکرداری تێپەڕ، بە پیتی (ال) هاتووە، دەبێتە (دان لە) جارێکیان بەکرداری تێپەڕ بە پیتی (ب) هاتووە دەبێتە (دانە بە). واتای یەکەم، ئەگەر بڵێین (دان دینا) بە واتای ئەوە دێت: خاوەندارە، حاکمە، بەڕێوبەرە، زاڵە، بڕیار بەدەستە،

---

(١) سورەتی (الروم) ئایەتی (٣٠)

پاداشت و سزا دەرە، خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ . (اي يوم المحاسبه والجزاء)، واتە: (ڕۆژی پاداشت و سزا، لە فەرموودەدا هاتووە: (الكيس من دان نفسه)، واتە: (عاقل ئەو کەسەیە کە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی دا بکات).

٢- ئەگەر بڵێین (دان له) بە واتەی ملکەچی و بەندایەتی وخودا پەرستی دێت. وشەی (الدين لله) دوو واتا هەڵدەگرێ، (الحكم لله) يان ( الخضوع لله)، واتە: (حوكم بۆ خودا، یان، ملکەجی بۆ خودا ).

٣- ئەگەر بلێین (دان بالشيء)، واتە کردی بەدین و مەزهەبی خۆی، یان هەڵگری فلانە ئایین و بیروباوەڕە، وەك دەڵێت: (هذا ديني وديدني)[1]، واتە: (ئەمە ئایین و ئاییندارییمە ).

## پێناسەی دین لەڕووی بەکار هێنانەوە

بەتەنها پێناسەی (دین) لە زمانەوانی ناتوانێ واتای (دین) بزانین، تا پێناسەی نەکەین لە ڕووی بەکارهێنانیەوە.

**(ئیبن کەمال):** پێناسەی (دین) ی بەم شێوەیە کردووە دەڵێت: (الدين وضع الهي يدعو اصحاب العقول إلى قبول ما هو عن الرسول)، واتە: (دین دانراوێکی خودایە خاوەن عەقڵەکان بانگ دەکات بۆ قبوڵکردنی پەیامی پێغەمبەر).

**(ئەلتهانوی) دەڵێت:** (وضع إلهی سائق لذوي العقول السليمة باختيارهم إلى الصلاح في الحال، والفلاح في المآل)[2]، واتە: (دین دانراوی خودایە، دەستگرە بۆ خاوەن عەقڵەکان، بەویستی خۆیان هەڵیدەبژێرن بۆ خۆشگوزەرانی چاکسازی لە دونیا سەرفرازی لە دوارۆژ).

---

(١) الدين والسياسة ردوود والشبهات، يوسف القرضاوى (ل ١٩)، (الدين، محمد عبدالله دراز (ل ٦٦ )

(٢) كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم للتهاوني (ب ١ - ٨١٤)

**(دکتۆر موحەممەدعەبدوڵلا دراز) دەڵێت:** (الدين وضع الهى يرشد الى الحق في الاعتقادات، والى الخير في السلوك والمعاملات)[1]، واتە: (دين دانراوی خودایە ڕێنوێنی خەڵك دەکات بۆ ڕێگای ڕاست لە بیروباوەڕ، بۆ خێر لە هەڵسوکەوت و معاملات).

## پێناسەی رۆژئاویەکان بۆ دین

دیارە ڕۆژئاوییەکانیش پێناسەیان هەیە بۆ (دین)، چەند نمونەیەك وەردەگرین.

- **(شیشرون) دەڵێت:** (الدين هو الرباط الذي يصل الإنسان بالله)، واتە: (دین ئەم بەستەریە کە مرۆڤەکان بە خودا دەبەستێتەوە).

- **(الاب شاتل) لە کتێبی (قانون الانسانیە)دا دەڵێت:** (الدين هو مجموعة واجبات المخلوق نحو الخالق, وواجبات الإنسان نحو الله، وواجباته نحو الجماعة، وواجباته نحو نفسه)[2]، واتە: (دین کۆمەڵێك ئەرك و بەرپرسیاریەتی دروستکراوەکانە بەرامبەر خودا، ئەرك و بەرپرسیاریەتی مرۆڤەکانە بەرامبەر خودا، ئەرك و بەرپرسیاریەتی بەرامبەر خەڵك، ئەرك و بەرپرسیارەتی بەرامبەر بە خۆی). بەپێی ئەم پێناسانە ئایین لەلای موسڵمانان، عەلمانیەکان، ڕۆژئاواییەکان، دەرکەوت تەنها یەك پێناسە هەڵدەگری ئەویش دانراوی خودایە، واتە: خودا دایناوە و ناردوویەتی لەڕێگای پێغەمبەران (سڵاوی خودایان لەسەر بێت) بۆ مرۆڤایەتی، دەستی مرۆڤەکانی تێدا نییە، ئەوانی تر کەپێیان دەڵێن ئایین، ئایینی دروستکراوی دەستی مرۆڤەکانە، دایاناوە بەپێی تێگەیشتن و بۆچوون و شارەزایی زانست و زانیاری کەسەکان، ئەم جۆرەیان کاریگەری لایەنگیری و ڕەهەند و ژینگەی مرۆڤەکانی لەسەرە، بەم پێیە ئایینی ڕاست تەنها ئەم ئایینەیە کە لەلایەن خوداوە نێردراوە بۆ سەرجەم پێغەمبەران، کەموکوڕی و زیادەڕۆی تێدانییە، گشتگیرە، لایەنگیری کەسی تیدا نییە[3].

---

(١) الدين، محمد عبدالله دراز (ل ٢٨)

(٢) ئەم دوو پێناسەم لە کتێبی (الدین)ی (د. محمد عبدالله دراز) وەرگرتووە (ل ٢٩)

(٣) بەپێی ئەم پێناسانە تێگەیشتنی زانایان لە دەقەکان نابن بە (دین)، (واجب) نییە

## جـیاوازی نێـوان ( تدیـن و دیـن )

زۆرترین پرسیار کە لەم سەردەمەدا دەکرێ، دەتوانین بڵێین بریتیە لە جیاوازی نێوان (تدین و دین )، بابەتی (ئینتیما ) بۆ ئایین لەگەڵ غەریزە و هەست و (شعور بە تدین) لە خودی مرۆڤەکان. لە پێشەکی ئەم نوسراوەدا شتێك ئاماژەم بەوە کرد، کە لە کوردستان ئەم جیاوازیە بە ڕونی نابینرێت دەرکەوێت لەلایەن موسلمانانەوە ئاڵوزیەك لەتێکەیشتنی ئەم بابەتە هەبێت.

زۆربەمان (مومارەسەی تدین) دەکەین وەك غەریزە، هەستکردن بە خوداپەرستی بەرزڕاگرتنی پیرۆزییەکان، کە کار دێتە سەر ئەوەی ئایا ئیسلامت دەوێت وەك ئایین، (عقیدة)، سیستەمی حوکمڕانی ڕاست وڕێك، یان عەلمانیەت، ڕێك عەلمانیەت بە سیستەم و حوکمڕانی دەزانی دەنگی پێدەدات و هەڵیدەبژێرێ هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بیانوانە:

١- ئایین پیرۆزە لەگەڵ سیاسەت تێکەڵی مەکەن.
٢- ئایین و سیاسەت نەگوتراوە.
٣- زانایانی ئایینی با تێکەڵ بە سیاسەت و حوکمڕانی نەکەین.
٤- ئایینداری خۆت بکە، پەیوەندیت بە کەسەوە نەبێ.
٥- ئایین بە سیاسەت مەکەن.

ئەم پاساوانە پاساوی فکری عەلمانین لەناو موسڵمانان جێگیربووە و دەوترێتەوە. پێویستە ئەم جیاوازییە ڕوون بکەینەوە، جیاوازی نێوان (دین) و (تدین) وەك جیاوازی نێوان (فکر و تفکیر)، ئایین سیستەم و یاسای نەگۆڕە، (تدین مومارەسە و غەریزەی) تاکێکە ئەنجامی دەدات، بەهۆی ئەم غەریزەیەی

---

مرۆڤەکان پێیەوە پابەند بن، بۆیە تێکەڵکردنی دەقی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ تێگەیشتنی زانایان تاوانە، بەتایبەتی ئایینی خودا هەڵەی تێدانییە، بەڵام مرۆڤەکان تەنانەت ئەگەر زاناش بن دەکرێ هەڵە بکەن (کل بن ادم خطاء).

کەلە ناخی مرۆڤەکانەوە هەیە. (تدین) حاڵەتێکی میتافیزیکیە، دەردەکەوێ و دەشاردرێتەوە، بەپێی شوێن و کات و مومارەسەی کەسەکەیە لەکۆمەڵگا، زۆرجار ئەم (غەریزەیە) بە کۆمەڵێك شتی تر پڕدەکرێتەوە، وەك هونەر، سینەما، یاری تۆپێن، ڕاگەیاندن بینراو و بیستراو و خوێنراو، لەگەڵ چەندین شتی سەردەمی کەسەکە بەپیرۆزییان دەکات، لە شوێنی غەریزەی تدین دایاندەنێ.

**- فەیلەسوفی ئەڵمانی (هیگڵ) ئەم ڕاستیەی دەرخستوە دەڵێت:** (قراءة الصحف هي الصلاة اليومية للإنسان المعاصر). واتە: (خوێندنەوەی ڕۆژنامە نوێژی ڕۆژانەی مرۆڤەکانە لەم سەردەمەدا).



**- (دکتۆر عەبدولمەجید نەجار) دەڵێت:** (ان الحقيقة الدين تختلف عن الحقيقة التدين، ان الدين هو ذات التعاليم التي هي شرع الهي، والتدين هو الشرع بتلك التعاليم، فهو كسب انساني)[1]، واتە: (دین جیاوازە لەگەڵ تدین، دین ئەم یاسا و ڕێنوێنانەیە، کە خودا داینا‌وەو، شەرعی خودایە، بەڵام تدین کارکردنە بەم یاسا و ڕێنوینانە، ئەمەشیان کردەوەی مرۆڤەکانە لەکۆتاییدا تدین غەریزەیە، دین سیستەم و عەقیدە و نیزامە).

## پەیوەندی دین بە ئەخلاق

ئایین و ئەخلاق دوو (ئەصلی) جیاوازن لەکۆتاییدا یەکدەگرنەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەم دوو چەمکەی بەجیا هێناوە دەفەرموویێت:
(إذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه)[2].

ئایین و ئەخلاق دیارە جیاوازن. بۆیە ناوی هەردووکیانی هێناوە. وەك دوودار لەتەك یەك بن (ئەصلەکانیان) جیاوازە، لق و پۆپیان لەسەرەوە دەگەنە یەك، دەست لەملانێ دەکەن، هەریەك سێبەر لەویتر دەکات، بەڵام ئەم دوو چەمکە بێ

---

(١) (كتاب الامة عبدالمجيد النجار)

(٢) سنەنی ئیمامی ترمذی (ب٢ - ل ٣٨٥)

یەك ناتوانن وەك تەواوکەری یەکتر دەبینرێت. ئەگەر بڵێی: فڵان خاوەن ئایینە بیرت بۆ ئەوەی دەچێت، کە پەیوەندی رۆحی بەهێزی هەیە، بەڵام کە گوتت فڵان کەس خاوەن ئایین و ئەخلاقە، واتە لە هەردوولایەنەوە تەواوە.

ئایین ئەخلاق دروستدەکات، بەهێزی دەکات، گشتگیری دەکات، ئایین هەڵسوکەوت و هەڵسان و دانیشتن و کڕین و فرۆشتن و سلوکی مرۆڤ دیاری دەکات. بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت:
(الدين المعاملة)، واتە: (دین هەڵسوکەتە)، هەڵسوکەوتیش (سلوك و ئەخلاقە).



## پەیوەندی ئـایین بە فەلسـەفە

ئایا بابەتە فەلسەفیەکان هەمان بابەتی ئایینی نین؟ ئایا ئایین گرفتی سەرجەم پرسیارە فەلسەفیەکانی وەڵام نەداوەتەوە؟ ئامانج و داواکاری فەلسەفە زانینی بوون و ئامانجەکەیەتی؟ هەروەها ئامانجی خۆش بەختی و بەختەوەری مرۆڤەکان لە دوونیاو دوا ڕۆژ دا نیە؟ ئەم دوو بابەتە سەرەکیە بابەتی فەلسەفیین لە هەردوو ڕوی زانستی و کرداری، ئەمانەش بابەتی سەرەکی دینن بە مانا فروانەکەی. دیارە ئەم دوانەش لە بنەڕەت دا بابەتەکەیان یەکە، بەڵام لە دەرئەنجام دا جیان. مەرج نیە مادەم لە بنەڕەتدا بابەت یەك بێت، نەتیجەش یەك دەبێت.

مەزهەبە فەلسەفیەکان ڕاجیایەکی یەکجار زۆریان هەیە لەنێواندا لە بارەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسارانە لێرەدا ئێمە نامانەوێت باسی بکەین، بابەتی ئێمە نیە کەواتە دین و فەلسەفە لە بنەڕەتدا یەکن لە نتیجەدا جیان .

هەرچەندە لە پێناسەکانی فارابی، ئیبن سینا، دەردەکەوێت، کە ئایین و فەلسەفە لە بابەتیش دا جیاوازن وە خاڵی هاوبەشیان هەیە.

## پەیوەندی ئایین لە گەڵ زانستەكانی تر

زانیمان كە ئایین و ئەخلاق و فەلسەفە وەك یەك خێزان وان، یەكتر تەواو دەكەن، لەگەڵ یەكتری دەژین و هاودەمن. زانستە مرۆییەكان بەرهەمی بیر و هزری مرۆڤەكانن بە پشت بەستن بە (وەحی) خودایی، سەرەتا پێغەمبەران بە زانست و زانیاری زۆرەوە لەلایەن خوداوە نێردراون، هەواڵ و بیروهزری مرۆڤەكانیش زانستی مرۆیی بەرهەم هێناوە، بۆیە ئایین سەرچاوەی بەهێزی بیروهزری مرۆڤەكان بووە، زانستەكانی بەرهەم هێناوە، كەواتە پەیوەندییەكی بەهێز هەیە لە نێوان زانستی خودایی لەگەڵ سەرجەم زانستەكانی تر وەك: زانستی سروشتی، بیركاری، گەردوونی، دەروونی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، مێژوویی، زمانەوانی، تا دەگاتە فكری سیاسی.

ئەم زانستانە گشتیان لە بونەوەر دەكۆڵنەوە، كەواتە ئایین و سەرچاوەكانی، كە پەرتوكە ئاسمانیەكانن، تەواوی زانستە مرۆییەكانی وەك یاسا و ڕێسای باسكردووە وردەكاری بۆ مرۆڤەكان جێهێشتووە تا پەرەی پێ بدەن و گەشە بكەن.

### وشەی ئایین لە قورئاندا

وشەی ئایین لە قورئاندا بەچەند شێوازێكی جیاواز هاتووە، بەپێی (سیاقی) ئایەتەكان واتاكانیشی دەگۆڕێ. دەكرێ بەم شێوازە پۆلینی بكەین:

١- بە واتای ڕۆژی پاداشت و سزا هاتوە، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾[١]

واتە: (خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە).

٢- گۆیرایەڵی خوا پەرستی ﴿ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ ﴾[٢]

---

(١) سورەتی (الفاتحە) ئایەتی (٤)

(٢) سورەتی (النساء) ئایەتی (١٤٦)

واتە: (بەتەواویی دین و ئاینیان ساغ کردۆتەوە بۆ خوا).

٣- بیرو باوەڕو پایەکانی ئایین:

﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾[1]

واتە: (ڕێبازی ئاین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی، کەفەرمانی پێکردووە بە - نوح -، هەر بەوشێوەیە قورئانیشی بۆ تۆ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) وەحی و نیگا کردووە و بە ئیبراهیم و موساو عیساشمان ڕاگەیاندووەکە ڕێبازی ئاین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایادار بن، ئەم بانگەوازە ڕاست و دروستە زۆر بەلای بت پەرست و خوانەناسانەوە گران و زەحمەتە، بەڵام خوای دانا خۆی کەسانی شایستە هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی ئاینەکەی ڕێنمویی خەڵکانێك دەکات، کە بگەڕێنەوە بۆ لای بەرنامەکەی بەپەرستن و ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاك.).



٤- ئایین بەمانای ئیسلام:

﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾[2]

واتە: (ئایا ئەوانە بێجگە لە ئاینی خوا ئاینێکی تریان دەوێت؟! لەکاتێکدا کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە بە ڕەزامەندی بێت یان بەناچاریی تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە).

٥- ئایین بە مانای ئایینی میللەتان بەگشتی:

﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ﴾[3]

واتە: (دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم).

---

(١) سورەتی (الشوری) ئایەتی (١٣)

(٢) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٨٣)

(٣) سورەتی (الکافرون) ئایەتی (٦)

**٦- ئایین بە واتای (حوکم) و دادوەری:**

﴿مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾(١)

واتە: (نەدەبوو بەدەستووری پاشا براکەی گل بداتەوە، مەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت).

## ئایین و ئیسلام، مەبەست و جیاوازی

ئایا ئایین مەبەستی پێ ئیسلامە یان نا؟ ئەمە پرسیارێکە و بە چەند شێوازێك وەڵام دراوەتەوە، بێگومان وشەی ئایین بەتەنها واتای ئیسلام ناگەینێ، بەڵام ئەگەر بیدەینە پاڵ ئیسلام (دین الاسلام)، یان بیدەینە لای الله (دین الله)، یان هەق (دین الحق)، ئەوا مەبەستی پێ ئیسلامە و بەس، ئەگەر نەدرا پاڵ ئەم وشانە بەمانای ئیسلام نایەت، ئەوکات دین بەشێکە لە ئیسلام، شەریعەتی ئیسلام یەکێك لە ئامانجەکانی پاراستنی ئایینە کە پێی دەڵێن پاراستنی (دین). پاراستنی ئایین ناوەرۆك و کاکڵی ژیانە، نهێنی بوونە، لە پێناو ئەمەدا خودا ئاسمان و زەوی دروستکردووە، پێغەمبەرانی ناردووە:

﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾(٢)

واتە: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن). کەواتە ئایین پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا دیاری دەکات. وشەی ئیسلام فراوانترە لە وشەی ئایین.

---

(١) سورەتی (یوسف) ئایەتی (٧٦)

(٢) سورەتی (الذاریات) ئایەتی (٥٦)

## ئیسلام: پێناسە و چەمك

لەجیهاندا دوو بانگەشە هەیە، بانگەشەیەك بۆ ئاوەدانكرنەوەی زەوی مەبەست تیادا تەنها خۆشگوزەرانی و چێژ وەرگرتنە، بانگەشەی دووەم بۆ جێنشینایەتی مرۆڤە لەسەر زەوی، مەبەستی ئاوەدانكرنەوە و گوێڕایەڵی خوداپەرستیە. بانگەشەی یەكەم پەیام و ڕێسا و یاسا ئاسمانیەكان ڕەت دەكاتەوە، یان بەلایەنی كەم كاری پێ ناكات لە سیستەمی ژیانی، ژیان بەخواردن و خواردنەوە و ڕابواردن بەسەر دەبات، پێی وایە دوارۆژ نییە و ئەوەی هەیە ژیان و مردنە، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿هَيۡهَاتَ هَيۡهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ﴾[١]

واتە: (دوورە و زۆر دوورە ئەو هەڕەشەیەی، كە لێتان دەكرێت بێتە دی و زیندوو بكرێنەوە).

بەڵام بانگەشەی دووەم. بانگەشەی ئیسلامە بۆ مرۆڤەكان مومارەسەی جێنشینایەتی بكەن لەسەر زەوی.

﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ﴾[٢]

واتە: (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەوە بكە لە دێرین زەماندا پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم بۆ ئاوەدانی و دینداری).

ئیسلام بانگەشەی پێغەمبەرانی خودا بووە، تا خەڵكان باوەڕ بە خودا بێنن، مرۆڤەكان پشت گوێی نەخراون، كراون بە جێنشینی سەر ڕووی زەوی، ژیانیان

---

(١) سورەتی المؤمنون ئایەتی (٣٦)

(٢) سورەتی البقرە ئایەتی (٣٠)

دراوەتی دوای، کە نەبوون، جارێکی تریش زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژی دوایی، دوای باوەڕهێنان بە پێغەمبەران گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بکەن.

## پێناسەی ئیسلام

**پێناسەی ئیسلام لەزمانەوانیدا: ئیسلام لە زمانەوانیدا بەسێ مانا هاتووە:**

**یەکەم:** خۆبەدەستەوەدان (الاستسلام)، واتە: بازنەی ئاشتی بەشێوازێك هەموو تاکێك لە ئاستی ئەمانەتدا بێت، کەس ئازاری کەس نەدات.

**دووەم:** گوێڕایەڵی فەرمانەکان (الانقیاد)، واتە گوێڕایەڵ بوونی ئەندامەکانی لەشە.

**سێیەم:** ملکەچی (الخضوع)، واتە: خۆ بەدەستەوەدانێکی تەواو بێ دوو دڵی.

## پێناسەی ئیسلام لەروی شەرعەوە

**١-** ئیسلام لە ڕووی شەریعەتەوە هەرسێ واتای سەرەکی لەخۆ دەگرێت: کە (استسلام، انقیاد، الخضوع)ـە بۆیە پێناسەیەکی (جامعی) هەیە، زانایان دەڵێن: (الاسلام: هو ما شرعه الله سبحانه وتعالی علی المسلمین، لاتباع اوامره واجتناب نواهیه)، واتە: (ئیسلام ئەم ئایینەیە کە خودا بڕیاری داوە بۆ موسڵمانان تا فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و لە قەدەغە کراوەکان دوور بکەنەوە.

**٢-** لە گفتوگۆی نێوان (جبریل) و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێناسەی ئیسلام کراوە، کاتێك (جبریل) پرسیاری لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد فەرمووی:

(فاخبرني عن الاسلام فقال (صلی الله علیه وسلم) ان تشهد ان لااله الا الله، وان محمد رسول الله، وتقیم الصلاة، وتوتي الزکاة، وتصوم رمضان، و تحج البیت ان اسطعت الیه سبیلا)[١]

---

(١) موسلم گێڕاویەتیەوە (ب١ - ل ٣٦)، ژمارە (٨)

واتە: (هەواڵم پێ بدە لەبارەی ئیسلام پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی شاهدی دان بەوەی کە خودا تاك و تەنهایەو هیچ خودایەك جگە لەو نیە، بەرپاکردنی نوێژ، زەکات دان، ڕۆژوگرتن، حەجکردنی ماڵی خودا ئەگەر توانات هەبوو).

٣- ئیسلام بە واتای سیستەمێکی گشتی، یاسایەکی گشتی بۆ هەموو کاروباری ژیان، ڕێڕەوی هەڵسوکەوت و (سلوك و ئەخلاقی) مرۆڤ. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی لەلایەن خوداوە، فەرمانی پێکراوە بیگەیەنێ وە ڕایگەیاندەوە، لە دوایی هاتنی ئیسلامیش هیچ ئایینێکی تر قبوڵ نییە.



﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾[١]

واتە: (جا ئەوەی بێجگە لە ئایینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە).

٤- ئیسلام کۆمەڵێك (ئەحکامی ئیمان)، ئەخلاق، بەندایەتی، مامەڵەکردن، بەسەرهات، هەواڵ. لە قورئان و سونەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە. خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووە بیگەیەنێ و بانگەشەی بۆ بکات.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾

واتە: (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی بۆت دابەزیوە ڕایگەیەنە، ئەگەر وانەکەی ئەوا تۆ بەکاری خۆت هەڵنەستای).

ئەوەی خودا دایبەزاندوە قورئان و سونەتی تەواوی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، ئەحکامەکانیش کە باسمان کرد ئایینی خوداش کە ئیسلامە چەند پێناسەیەکی هەیە[٢].

---

(١) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٨٥)

(٢) (اصول الدعوة، د. عبدالكريم زيدان)

خەڵکانێك بەتایبەتی لەسەردەمی ئێستای باوی عەلمانییەت، واگومان دەبەن، کە ئیسلام وەك ئایینەکانی تر ئایینێکی روحییە و سیستەم ژیانی تێدا نییە. بەتایبەتی ئەوانی بانگەشەی (فصل الدين عن الحياة) دەکەن، ئیسلام ئایینە، پەیامە، (عەقیدەیە)، ژیانی لەسەر بنیاددەکرێت، بیروهزرە بۆ چارەسەری گرفتەکانی ژیان، سیستەمێکە ڕێز و پایەی مرۆڤەکان دەپارێزێ، ژیانی ڕۆژانە ڕێکدەخات، هەڵسوکەوت و ئاکار و ڕەوشتیان دیاری دەکات، سیستەمێکی زۆر ورد و سەرکەوتووە، جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان دینێك، کە تەنها روحە و سیستەمی تێدا نییە، لەگەڵ ئیسلامێك کە پەیڕەو و یاسای ژیانە. ئیسلام کۆمەڵێك چەمکی ژیانی هێنا، هیچ بوارێك لە بوارەکانی ژیانی پشتگوێ نەخستووە، بیروباوەڕی بۆ مرۆڤ دیاریکرد ئینجا کردەوەی مرۆڤەکانی بەپێی ئەم بیروباوەڕە ڕێکخست، خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴾[1]

واتە: ( چاك بزانەو دڵنیابە جگە لەخوا، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای لێخۆشبوونی گوناه بۆ خۆت بکە ).

سەرجەم جومگەکانی ژیانی بە سیستەم ڕێکخستووە، لەبواری پەرستشەکان کە (ئیمان) و (عەقیدە) و ئەخلاق دەگرێتەوە، لە بواری مامەڵەکردن، کە کڕین و فرۆشتن و بازرگانی دەگرێتەوە، لەبواری کۆمەڵایەتی ژن و ژنخوازی و ئەخلاق و بەشەکانی دەگرێتەوە، لەبواری سیاسەتدا حوکم و دادوەری و قەزا دەگرێتەوە. بەشێوەیەك، کە چۆن بابەتە ئایینەکانی ڕێکخستووە، ئەوانەی تایبەتن بە دوارۆژ ئاواش بابەتی دونیاشی ڕێکخستووە. چۆن نوێژی ڕێکخستووە بەشێوازێکی تایبەت ئاواش کڕین و فرۆشتنی ڕێکخستووە، زەکاتی بە ڕێگای تایبەت دیاریکردووە ئاواش هاوسەرگیری چارەسەرکردووە. حەج و مامەڵەکردن، نزا و پاڕانەوە، بەهەشت و جەهەننەم و ئایین و دونیا هتد...، هەموو بەشیوازێکی هاوسەنگ ڕێکخراوە.

-----

(١) سورەتی (محمد) ئایەتی (١٩)

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾[1]

واتە: (هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیوی،ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕە و بەشی خۆشت لە دونیادا بەحەڵاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە، هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناهـ و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت تۆوی خراپە دەچینن).



بەم شێوازە بۆمان دەردەکەوێت ئیسلام (عقیدە و شەریعەیە)، عەقیدەیەکی زانستی شەریعەیەکی کردەیی، عەقیدەیەك کە بنچینەی ئایینە، شەریعەیەك لقی ئایینە، ئیسلام (عەقید و نیزام، ئیمان و سلوك، ئە صل و فەرع)ی بەیەکەوە بەستاوەتەوە، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت:

(من كان يؤمن بالله واليوم الاخر) ئەوە (عەقیدەیە) (فليكرم ضيفه) ئەمە (نیزامی سلوکە).

## ئیسلام ئایینی سەرجەم پێغەمبەرانە

ئیسلام واتە (تەسلیم) بوون بۆ خودا بە گیان بە دڵ، جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، دورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، یەکتاپەرستی بێ هاوبەش بڕیاردان. ئەمەیە ئیسلام. بەم جۆرە خودای گەورە هەموو پێغەمبەرانی ناردووە، پەرتوکە ئاسمانیەکانی دابەزاندووە، کە خودا تاکە و هاوبەشی نییە و دەبێ بپەرسترێت، کەواتە ئەوە ئایینی هەموو پێغەمبەرانە لە ئادەمەوە هەتا (خاتەم)، جگە لەم ئایینە ئایینەکانی تر ئاسمانی نین و لەلایەن مرۆڤەکانەوە دروستکراون، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴾[2]

---

(١) سورەتی (القصص) ئایەتی (٧٧)

(٢) سورەتی (الأنبياء) ئایەتی (٢٥)

واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەك نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن).

هەموو پێغەمبەران ئەم بانگەشەی ئایینی ئیسلامیان کردووە داوایان لە خەڵك کردووە بەدوای ئیسلام بکەون و ئیسلام بکەن بە ئایین و بەرنامەی ژیانیان.

١- پێغەمبەر نوح (سڵاوی خوای لەسەربێ) فەرمان بە گەلەکەی دەکات دەفەرموێت:

﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾[1]



واتە: (جا ئەگەر پشتم تێبکەن و باوەڕم پێنەکەن، پێم سەیرە چونکە ئەوە من هیچ پاداشتێك و هیچ شتێکم لە ئێوە داوا نەکردووە، بەڵکو پاداشتم تەنها لەسەر خوایە و من فەرمانم پێ دراوە کەلە ڕیزی موسوڵمانادا بم).

٢- پێغەمبەر موسی (سڵاوی خوای لەسەربێ) بە گەلەکەی دەفەرموێت:

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾[2]

واتە: (موساش بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و عەشرەتم، ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان بەخوا هێناوە، ئەوە ئیتر پشت بەو ببەستن ئەگەر موسڵمان و ملکەچن).

٣- حەواریەکانی دەوروبەری عیسی (سڵاوی خوای لەسەربێ) فەرموویان:

﴿ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾[3]

---

(١) سورەتی (یونس) ئایەتی (٧٢)

(٢) سورەتی (یونس) ئایەتی (٨٤)

(٣) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٥٢)

واتە: (جا کاتێك عیسا هەستی بە کوفر و بێ دینی ئەوانە کرد وتی: کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا، کێ دێت تا پێکەوە بەرنامەی خوا بگەیەنین، حەوارییەکان وتیان: ئێمەین پشتیوانانی دین و ئاییینی خوا، باوەڕی تەواومان بەو خوایە هێناوە، تۆش شایەتی بدە، کە بەڕاستی ئێمە موسڵمان و ملکەچ و فەرمانبەردارین).

٤- (ساحیرەکانی ) فیرعون کاتێك باوەڕییان هێنا و داوای موسڵمانیەتیان کرد:

﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴾[1]



واتە: (تۆ هیچ بێزاریەکت لە ئێمە نییە، جگە لەوە کە باوەڕمان بە بەڵگە و موعجیزەکانی پەروەردگارمان هێناوە، کاتێك بۆمان هات، پاشان دەستی نزا و پاڕانەوەیان بەرز کردەوە و وتیان: پەروەردگارا خۆگری و ئارامیمان بەسەردا بڕێژە و بە موسوڵمانێتی بمانمرێنە).

٥- پێغەمبەر سولەیمان (سڵاوی خوای لەسەربێ ) کاتێك نێردراوی نارد بۆ لای بەلقیس پێی دەفەرمووێت:

﴿ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴾[2]

واتە: (خۆتان بەگەورە مەزانن و لێم یاخی مەبن و وەرن موسوڵمان ببن، واز لە خۆر پەرستی بهێنن و بەدیهێنەری خۆر و مانگ و ئەستێرەو زەوی و هتد.. بپەرستن).

٦- (مەلیکەی سبأ) موسوڵمان دەبێ دەفەرمووێت:

﴿ وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾[3]

واتە: (وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی تا ئێستا ستەمم لە خۆم کردووە، ئیتر وا

-----------------------------------

(١) سورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٢٦)

(٢) سورەتی (النمل) ئایەتی (٣١)

(٣) سورەتی (النمل) ئایەتی (٤٤)

لەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم).
خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾(١)

واتە: (بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە).

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾(٢)

واتە: (جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت).

کەواتە ئیسلام ئاینی سەرجەم پێغەمبەران بووە، خودای گەورە لەبارەی پێغەمبەر ئیبراهیم (سڵاوی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێت:

﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾(٣)

واتە: (ئاشکرایە کە ئیبراهیم نە جوولەکە بووە، نە گاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردار و موسڵمان بووە، لە دەستەی موشریك و هاوەڵگەران نەبووە).

هەر پێغەمبەر ئیبراهیم (سڵاوی خوای لەسەربێ) ناوی لە ئێمە ناوە موسوڵمان:

﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ ﴾(٤)

واتە: (هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناوی بردوون).

---

(١) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٩)

(٢) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٨٥)

(٣) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٦٧)

(٤) سورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)

## جیاکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە ژیان

بیرۆکەی (فصل الدین عن الحیاة) سەدەیەکە جیهانی ئیسلامی داگیرکردووە، دوای کودەتاکەی (مستەفا کەمال ئەتاتورك) بەسەر خیلافەتی ئیسلامی. دوای ئەوە سەرمایەداری جیهانی ئیسلامی داگیرکرد، ئەم بیرۆکەیە دزەی کرد بۆناو وڵاتی موسڵمانان و چووە نێو بیروهۆشی موسڵمانان. زۆربەی تاکەکانی ئێستا کاریگەری ئەم بیرۆکەیان لەسەرە، ئێستا جیهانی ئیسلامی بۆتە: (اسلامیة الامة، وعلمانیة الدولة)، واتە: (میللەت موسڵمانە و دوڵەت عەلمانیە).

### سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە

ئەم بیرۆکەیە بۆ ئەوە سەریهەڵداوە، کە ئیسلامیش وەك ئایینە گۆڕدراوەکانی تر دروشم و (تقدیسی) ئایینیە و بەس.

ئامانجیشیان ئەوەیە ئیسلام بۆ سیستەمی ژیان نەگونجاوە و ناشێت. ئەم بیرۆکەیە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلام نییە، چونکە ئەم بیرۆکەیە لە ئەوروپا لە مێژوویەکی تایبەت سەری هەڵداوە، دوای ململانی و جەنگێکی تاڵ، کۆمەڵگەی ڕۆژئاوای گەیاندە ئەوپەڕی لێکترازان و هەڵوەشانەوە.

**ئەم ڕووداوەش بە سێ قۆناغی مێژوویی یەک لەدوای یەک تێپەڕی:**

١- سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پێشوو کە کاکڵی ئایینی مەسیحی بوو

٢- چەرخ و سەردەمی ناوەڕاستی مەسیحیەت، کە جیادەکرێتەوە بە پەیوەندی دووقۆڵی لەنێوان دەوڵەت و ئایین (کڵێسا).

٣- سەردەمی ڕابوون و هەستانەوەی هزری و زانستی و ئابووری لە ئەوروپا، بەشێوازێك بیرۆکەی (فصل الدین عن الدولة) سەریهەڵدا و گەشەی کرد، تا عەلمانیەتی لێ بەرهەم هات. سەردەمی یەکەم کە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانیە، بەهیچ بنەمایەکی ئایینی نەبەستراوەتەوە، ئەم چەرخە زیاتر چەرخی

فەیلەسوف و بیرمەندان بوو، وەك سوقرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ، ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پشتی بەستبوو بە دەوڵەتی یاسا و توانا و هێزی سەربازی.
لەم سەردەمە ئایینی مەسیحی لەشێوەی گروپ گروپی بچوك سەریانهەڵدا، بەرەبەرە فراوان بوو، تا ئایینی مەسیحی جێ پێی خۆی بەهێزكرد لەناو ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی، لەوێوە دروشمی (اعط ما لقیصر لقیصر, وما لله لله))یان بەرزكردەوە.

- سەردەم و چەرخی ناوەڕاستی مەسیحی دووقۆڵی دەستی پێكرد: لە چەرخی پێنجەمی زایینی، ڕۆڵی كڵێسا ڕۆژبەڕۆژ بەهێز بوو، تا وای لێهات هەژموونی كەمتر نەبوو لە هەژموونی قەیسەر. لەم سەردەمە پەیوەندییەكە دوو لایەنە بووە لە نێوان دەوڵەت و كڵێسا. دەسەڵاتی قەیسەر و دەسەڵاتی كڵێسا بە دووقولی لەوكاتەدا جیهانیان بەڕێوە دەبرد. لەساڵی (١١٢٢) زایینی. ڕێكەوتنێك لەنێوان پاپا و قەیسەر لەژێر ناوی (concordar) مۆر كرا بۆ ڕێكخستنی كارەكانیان لەنێوانیاندا، لەم سەردەمە بیرمەند و ڕۆشنبیران كەوتنەژێر فشارێكی زۆری دەسەڵات، بزوتنەوەی زانستی زۆرلاواز و لەسەرخۆ بوو، دەسەڵاتی كڵێسا و قەیسەر زۆربەی موڵك و سامانیان داگیركرد لە ژێر ڕژێمی دەربەگایەتی، لەگەڵ ئەم ستەمە و زۆرداریە وردە وردە ئۆپۆزسیۆن پەیدا بوو لەناو كڵێسا، لەوانە (مارتن لوسەر) بزتنەوەی چاكسازی دروستكرد لە ئەڵمانیا لەساڵی (١٥١٧) زایینی، (مارتن) ڕووبەڕووی ستەمی كڵێسا ڕاوەستا و پێی وابوو ئەم زۆردارییە پێچەوانەی دروشمەكانی ئایینی مەسیحیە، هەروەها دژی (چەكی لێخۆش بونیش)[(١)]. ڕاوەستا. لەم نێوەندەدا ئەوروپا شەڕێكی ئایینی نێوان كاسۆلیك و پرۆتستانیتیەكانی بەخۆیەوە بینی، (١٠٠) ساڵی خایاند لەوێ (فصل الدین عن الدولة) لەدایك بوو. سەردەمی ڕاپەرین و هەستانەوە

---

(١) چەكی لێخۆش بوون (صكوك الغفران): ئەمە پسولەیەك بوو كڵێسا و پاپا بە خەڵكیان دەفرۆشت لە بری بەهەشت، واتە هەركەسێك ئەم پسولەی پێ بێ ناچێتە جەهەنەم بەڵكو دەچێتە بەهەشت، چەند پسولەكەی بەگرانتر لە كڵێسا بكڕێت ئەوەندە لە بەهەشت جێی خۆشتر دەبوو.

سەردەمێکی زێڕین بوو، گرنگیەکی زۆری هەیە لە مێژووی ئەوروپای نوێ، ئەم ڕابوونە بوو ئەوروپای ڕزگارکرد لە شەڕێکی خوێناوی (١٠٠) ساڵە، سەردەمی نوێکاری و داهێنان و شارستانیەت ژیاوە. چەند بیرمەندێکی گەورە سەریانهەڵدا جێگەی ئاماژە پێکردنە لەوانە: جۆن لوك، ئیماننوێل کانت، ڤۆلتێر، ئادم سمیث هتد...، چەندینی تریش لەدوای ئەوە، دەوڵەتی (فصل الدين عن الدولة)یان ڕاگەیاند، لەوانە ئەمریکا، هەر لەسەرەتاوە لە ساڵی (١٧٧٦)ی زایینی دەوڵەتی عەلمانی بووە. لە دەستووردا هاتووە ساڵی (١٧٨٩) زایینی دەڵێت: (ان الدين مسألة شخصية)، هەروەها فەرەنسا (فصل الدين عن الدولة) یەکێکە لەبەرهەمەکانی شۆڕشی (١٧٨٩) زایینی. دواتر لە تورکیا لە ساڵی (١٩٢٤) خیلافەتی ئیسلامی هەڵوەشایەوە، دەوڵەتی عەلمانی دامەزرا. کەواتە بابەتی (فصل الدين عن الدولة) هیچ پەیوەندییەکی نە لەدورەوە نە لەنزیکەوە بە ئیسلامەوە نییە، ڕەگوڕیشەی بۆ شوێن و ئایین و ئایدیایەکی تایبەت دەگەڕێتەوە[1].



---

(١) بروانە ( بيان الاسلام للرد على شبهات حول الاسلام)

## عەلمانیەت چی یە؟

**دائیرەی مەعاریفی بەریتانی عەلمانی وا پێناسە کردووە و دەڵێت:**

(secularism): (هي حركة اجتماعي تهدف الى صرف الناس وتوجيههم من الاهتمام بالاخرة, الى الاهتمام بهذه الدنيا وحدها)[١]

واتە: (عەلمانیەت: بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیە، ئامانجی ئاراستەکردنی خەڵکە لەگرنگیدان بە ڕۆژی دواییەوە بۆ گرنگیدان بە ژیانی دونیاوە بەتەنها).

- **(شێخ سەفەر حوالی) دەڵێت:** واتای تەواوی وشەی عەلمانیەت واتە (اللادينية او الدنيوية) واتە: (دوور لە ئایین، یان دونیایی)[٢].

## عەلمانی کێ یە؟

**عەلمانیەت یەک جۆر و شێوازی نییە، دەبێ پۆلین بکرێت بە سێ جۆر:**

**جۆری یەکەم:**

عەلمانیەتی بێ باوەڕ، (العلمانية الملحدة) ئەم جۆرەیان بڕوای بە خودا و ئایین نییە، هەروەها بڕوای بە سیستەمێکی ئایینیش نییە. بانگەشەکارەکان (مارکس) و (هیگڵ)ن.

----------------------------------

(١) EnsyBratannicavol.Hp19

(٢) العلمانية نشأتها وتطورها، سفر الحوالى (ب١ - ل ١٣)

## جۆری دووەم:

عەلمانیەتی خاوەن باوەڕ تەنها بەخودا: ئەم جۆرەیان بڕوای بەخودا هەیە بەڵام بانگەشەی دورخستنەوەی ئایین لە ژین دەکات. بانگەشەکاری ئەم جۆرە (ڤۆلتێر، جۆن لوك، دیکارت، بیکوت، جان جاك ڕۆسۆ).

- لە جیهانی ئیسلامیش (قاسم ئەمین)، ( تەها حوسێن، نەجیب عازوری، ساتح حصری، سەلامە موسا، ئەنوەر سادات، میشێل عەفلەق، ئەنتون سعادە، بورقیبە، زەین عابدین، جمال عەبدولناسر) بوون.

- لە تورکەکان: (مەدحەت پاشا، نامیق پاشا، تکلین ئەلب، زیا ئەلب کوك، ئەنور پاشا، مستەفا کەمال ئەتاتورك).

- لە ناو کوردان دوای دروست بوونی حیزبی (ئیتحاد تەعالی و تەرەقی) سالی (١٨٨٩) ئەم سەرکردانە هەڵگری ئەم جۆرە عەلمانیەتە بوون لەوانە: (ئیسحاق سکۆلی، عەبدوڵلا جودەت، رەفیق حلمی، شەریف پاشا، ئیبراهیم ئەحمد).

## جۆری سێیەم:

(عەلمانیەتی دیندار)، ئەم جۆرەیان تاکە تاکەی موسڵمانە، دیندارە، دڵی بە ئیسلام خۆشە، نوێژ و ڕۆژی دەگرێ، خێر دەکات، بەشداری مەراسیمەکانی ئیسلام دەکات، بەڵام لەگەڵ عەلمانیەکانیش هەنگاو دەنێ، دەنگیان پێ دەدات، لە دوایان دەڕوات، وا لە ئیسلام گەیشتووە نابێ لەگەڵ سیاسەت و دەوڵەت تێکەڵ بکرێت، پێی وایە ئیسلام تەنها بۆ مزگەوتە، زانایانی ئایینی کاریان (تەلقین) و مارەبڕینە و پێش نوێژییە.

## جیاوازی ئیسلام و عەلمانیەت لە ناوەڕۆك دایە

عەلمانیەت لە ناوەڕۆك لەگەڵ ئیسلام جیاوازە و تێکدەگیرێ، هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان بانگەشەکارانی عەلمەنیەت لەگەڵ عەرەبی سەردەمی نەزانی (جاهیلی)، عەلمانیەکان دەڵێن : (ما لقیصر لقیصر وما لله لله). عەرەبی بێ باوەڕی (جاهیلی) دەیانگوت:

﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ﴾[1]

واتە: ((ئەو هاوەڵگەرو نەفامانە) هەندێك لەوەی، کە خوا دروستیکردووە لە بەرو بوومی کشتوکاڵ و ماڵاتیان کردووە بە بەشی خواو وتویانە: ئەمە بەشی خوایە بەخەیاڵی خۆیان! (هەندێکی تریشیان جیاکردۆتەوە و وتویانە) ئەمەش بۆ بتەکانمانە! جا ئەوەی بۆ بتەکانیان بڕیاریان داوە ئەوە بەخوا ناگات، (واتە قبوڵ و پەسەند نیە، ئەوەش، کە بەخەیاڵی ئەوان) بۆ خوا بڕیاریانداوە، ئەوە دەگەیشتە لای بتەکان و بۆ ئەوان بوو، ئای کە دادوەریەکی خراپ و نادروست دەکەن).

ئەم جاهیلیەتەی عەلمانی سەردەم هەمان (جاهیلیەتی) پێشووە، هیچ جیاوازییەکی نییە، تەنها ڕووپۆشەکەی جیایە. ئەوان دەیانگوت مزگەوت بۆ خودا، مینبەر بۆ خودا، بەڵام ئابووری و سیاسەت و (حوکم) و بازاڕ و شتەکانی تر بۆ قەیسەر، ئێستاش عەلمانیەکان دەڵێن: ئیسلام لە کونجی مزگەوت، مردوو شۆردن، (تەلقین) دان، چونە سەرگۆڕستان نێوان خۆت و خودا، بەڕێوەبەردن و سیاسەت و (حوکم)، پەروەردە و فێرکردن هتد.. بۆ دەوڵەت، عەلمانیەت هەمان حوکمی سەردەمی (جاهیلی) دەوێت بەهەموو حوکمێکی سەر ئەم زەوییە کاردەکات، تەنها حوکمی ئیسلامی قبوڵ نییە.

---

(١) سورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٣٦)

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾[1]

واتە: (ئایا ئەوانە حوكم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە، ئاخر بۆ بیرناكەنەوە كێ هەیە بەقەدەر خوا حوكمی جوان و چاك و بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو كەسانەی كە بە وردی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە).



## بیروباوەڕو ئامانجەكانی عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامی

**گوتمان عەلمانیەت چەندین جۆری هەیە، لێرەدا تیشك دەخەینە سەر بیروڕا و ئامانجەكانی عەلمەنیەت لە جیهانی ئیسلامی لەوانە:**

١- تانەدان لە قورئان، ئیسلام، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

٢- ئیسلام تەنها (تقوس ) و دروشمی روحییە.

٣- بانگەشەی ئەوە دەكەن ئیسلام ئایینی دواكەوتوویی و (جاهیلیە).

٤- ئیسلام لەگەڵ سەردەمی پێشكەوتن و زانست و شارستانیەت و ژیان ناگونجێ.

٥- جیاكردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەت.

٦- جیاكردنەوەی ئیسلام لە پەروەردە و فێركردن.

٧- پشت بە سیاسەتی (ماكیاڤیلی) دەبەستێ بۆ گەیشتن بە حوكم و دەسەڵات.

٨- بڵاوكردنەوەی ڕووتی و (ئیباحیەت).

٩- بانگەشەی ئازادی ئافرەت.

١٠- ناشیرین كردنی شارستانیەتی ئیسلامی.

-------------------------------

(١) سورەتی (المائدة) ئایەتی (٥٠)

# ئیسلام و سیاسەت

باسی مێژووی سەرهەڵدان و هۆکاری دروشمی (فصل الدين عن الدولة) مان کرد، گوتمان: هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، ماوەتەوە بڵێین: ئایا ئەم وتەیە ڕاستە (لا دين في السياسة، ولا سياسه في الدين)؟ بێگومان عەلمانیەکانی سەردەم بەبێ جیاوازی هەموویان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و مەرامی سیاسی خۆیان لەسەر سیاسەتی ماکیاڤیلی دەڕۆن، هەموو ڕێگایەك دەگرنەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانج و ئاواتەکانیان، بەبێگوێ دانە هیچ پێوەر و یاساو بنەمایەکی ئەخلاقی، (الغاية تبرر الوسيلة) ئەگەر بە ڕێرەوی ئیسلامی سیاسەت بکەن واتە: بەها، ئەخلاق، دادەوەری، پێوەر و یاسا و بنەماو دیاردە، ئەمەش ڕێگرە لەبەردەمیان، ئەگەر ئیسلام ببەستینەوە بە سیاسەت ئەوا ئەم دەرئەنجامەی دەبێت:

١- تیکەڵکردنی سیاسەت بە ئیسلام واتە دادپەروەری لە بەرپرسیارەتی و یەکسانی لە دابەشکردن .

٢- سەرخستنی ستەملێکراوان، لادانی ستەمکاران، (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا)، واتە: (براکەت سەر بخە ستەم کاربێ، یان ستەم لێکراو ) .

٣- وەرگرتنەوەی مافی بێ هێز و هەژار و بێ دەسەڵات .

٤- چاودێری بێ باوك و ئافرەت و لێقەوماوان .

٥- گەیشتن بە لوتکەی مرۆڤایەتی، ژیانی بەختەوەر، یەکتاپەرستی، دەروون پاکی.

٦- جێنیشنایەتی لەسەر زەوی، ئاوەدانکردنەوە بەهەق و دادپەروەری.

٧- کۆمەڵگەیەکی لێك نزیك، هاوشان و هاوکار، یەکترناسی و (صیلەی رەحم).

٨- (ئەخلاقی) بەرز، ئامانجی باڵا، ئاواتی دیاریکراو.

٩- دەستپاك و دوور لە گەندەڵی، حەڵاڵ خۆری دوور لە حەرام، یارمەتیدەر، دوور لە ڕەشوە.

١٠- گێڕانەوەی ماف بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگە بەبێ جیاوازی، تاکی موسڵمان بێ، یان نا، بەهێز یان بێ هێز، دەسەڵاتدار بێت، یان بێدەسەڵات، دەوڵەمەند بێ یان هەژار، ستەملێکراوی یان ستەمکار، گشتیان مافیان پارێزراوە ئەگەر ئیسلام تێکەڵ بەسیاسەت بکرێ .



## ئیسلام : سیستەمی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ە .

ئاماژەمان بەوەکرد، کە جیاکردنەوەی ئایین لە ژین هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوە نییە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی دانا لە شاری مەدینە، موسوڵمانان لە ژێر چەتری ئەم دەوڵەتە ژیان تا کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەم دەوڵەتە جوانترین وێنەی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد، لە مێژوودا وێنەی دەوڵەتێکی سیاسی بەم شێوازە پێشتر نەبوو، بەهۆی دادگەری و تایبەتمەندی ئەم دەوڵەتە، ئەم دەوڵەتە سیاسیە هەرسێ ڕەهەندی سەرەکی بە دەوڵەت بوونی هەبوو (گەل، خاك، دەسەڵات)، دەتوانین بڵێین: ئەم دەوڵەتە تاکە وێنە بوو لە سیستەمی سیاسی، کە بۆ یەکەم جار لەسەر بناغەی شەرعی دامەزرا، یان بناغەی ملکەچی دەوڵەت بۆ یاسا. بنچینەی ئەم دەوڵەتەش لەسەر بڕیاری (وەحی) دامەزرا. واتە دەسەڵاتەکان ملکەچی (وەحی) خودایی بوون بەگشتی. بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی سیاسی ئایینی زۆر دامەزراون وەك (فەراعینە) و فارسەکان، بەڵام هیچیان وەك دەوڵەتی ئیسلام ملکەچی یاسای خودای نەبوون، دەوڵەتی ئیسلامی، کە لە شاری مەدینە دامەزرا تا دوا خیلافەت کەلە تورکیا هەڵوەشایەوە سەرچاوەی بنچینەیی بۆ یاسا (وەحی)

ئاسمانی بوو، خودای گەورە دەفەرموویێت:

-﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾[1]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن، کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.).

-﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ ﴾[2]

واتە: (بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نی یە).

-﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ﴾[3]

واتە: (بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار نیە، کاتێك کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە).

---

(١) سوڕەتی (النساء) ئایەتی (٥٩)

(٢) سوڕەتی (یوسف) ئایەتی (٤٠)

(٣) سوڕەتی (الأحزاب) ئایەتی (٣٦)

دەسەڵاتە سیاسیەکانی ئەوکات پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە ژێر بڕیار و یاسای زیاتر تاکە کەسی بوو، یەکەم جار دەوڵەتی ئیسلامی بوو دەسەڵاتی خستەژیر ڕکێفی (وەحی) یان بلێین: قورئان واتە: یاسا. دەکرێ ئەم شێوازە بەرامبەر بکەین لەگەڵ جیاوازییەکی یەکجار زۆر بە دەسەڵاتی دەستوری سەردەم کە دەڵێت: (دەستور یان یاسا سەروەرە)[1]. بەم شێوازە دەوڵەتی ئیسلامی درێژەی هەبوو تا سیانزە سەدە، سیاسەت و حوکمی بەشێکی جیهانی دەکرد، ئەوە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە، کە ئیسلام سیستەمی سیاسی و حوکمە، لەهەموو جومگەکانی ژیان بەشدارە بەهیچ شێوەیەك جیاناکرێتەوە لە ژین، لەگەڵ ئەوەی باسکردنی هەریەك لە سیستەمی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی لە ئیسلامدا، چەندین بەرگ کتێبی دەوێ لەسەری بنوسرێ، بەڵام ئێمە بۆ بەرچاوی ڕوونی هەریەك لەم سێ چەمکە بەکورتی ڕوون دەکەینەوە. تا وەڵامی ئەوە بدینەوە کە ئیسلام بریتیەلە سیاسەتە و حوکم و دەسەڵات.

---

(١) بڕوانە: في النظام السياسي للدولة الاسلامية، محمد سليم العوا (ل ٣٨)

## سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا

ناگونجێ ئیسلام ئایینی خودا بێ و سیستەمی ڕێکخستنی ژیانی سیاسی تێدا نەبێت، ناکرێت ئومەتێك هەڵگری ئەم ئایینە بێت بەبێ سیستەم و حوکم بێت، ئایینێك خودا دایناب‌ێ، بێ بەرنامە و (فەوزەوی) بێت، بۆیە سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا (واجبێکی شەرعیە) و پێویستیەکی مرۆڤە، عەقڵی مرۆڤ بەتەنها نەیتوانیوە تەواو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ دیاری بکات.

## سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا لەچی پێکهاتووە

**سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا بەم شێوە دامەزراوە:**

**١- سەروەری و فەرمانڕەوایی بۆ شەرعە:** (السيادة للشرع)، واتە: جێبەجێکردنی شەریعەت وەك (عەقیدە)، سیستەم، دەوڵەت، یاسا، لە هەموو بەشەکانی ژیانی فەرمانڕەوایەتی لە بڕیاردان و حەڵاڵ و حەرام تەنها بۆ خودایە.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾[1]

واتە: (بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار نییە کاتێك کە خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە).

**٢- دەسەڵات بۆ (ئومەت):** ئومەت بۆی هەیە حاکم هەڵبژێرێ، لێپێچینەوەی لەگەڵ بکات ئەگەر لە (شەرع) لا بدات.

**٣- بەرپرسیاریەتی (حاکم):** حاکم بەرپرسە لەبەرامبەر خودا و خەڵك.

-------------------------------

(١) سورەتی الأحزاب ئایەتی (٣٦)

**٤- شـــورا:** شورا لە ئیسلام بنچینەی حوکمە:

﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾[(١)]

واتە: (کارو باریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاویژکاریە).

﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾[(٢)] واتە: (لە کارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە).

**٥- بەرپاکردنی دادگەری لە نێوان خەڵک:** لە سیستەمی سیاسی ئیسلامدا ئامانجی هەرە بەرز دادگەریە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾[(٣)]

واتە: (بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بەخزمان و قەدەغە لە گوناهـ و تاوان و دەستدرێژی دەکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێفکرن و هەر چاکە بکەن).

**٦- گوێڕایەڵی حاکم تا کار بە شەریعەت بکات:** لە سیستەمی سیاسی ئیسلامدا مادەم حاکم بە شەریعەتی خودا حوکم بکات، ئەمانەتی دەسەڵاتەکەی بپارێزی، ئەو کات دوو ماف لەسەر ئوممە ت واجب دەبێ مافی گوێڕایەلی و مافی بەسەر خستنی.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾[(٤)]

---

(١) سورەتی (الشوری) ئایەتی (٣٨)

(٢) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٥٩)

(٣) سورەتی (النحل) ئایەتی (٩٠)

(٤) سورەتی (النساء) ئایەتی (٥٩)

**٧- یەکبوون و یەکڕێزی ئومەت:** ئومەت لەژێر سیستەمی سیاسی ئیسلامی دەبێت یەك پارچە بێت، لەیەك هەڵوەشاوە و دژیەك نەبێت.

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾(١)

واتە: (هەر هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن).

**٨- دابینکردنی ئازادییەکان:** لە سیستەمی سیاسی ئیسلام ئازادی تاك و ئایین و (فکر) و سیاسەت و ئابووری سەقامگیرە بەپێی مەرج و بنەماکانی ئازادی.



﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾(٢)

واتە: (بەهیچ جۆرێك زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا).

**٩- یەکسانی لەنێوان خەڵک لە حوکمەکانی دا:** جیاوازی لەنێوان جۆر و ڕەنگ و زمان ناکات:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ ﴾(٣)

واتە: (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە (کەباوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە).

**١٠- پشت بەستن بە خاوەن شارەزایی و پسپۆڕی.**

---

(١) سورەتی (ال عمران) ئایەتی (١٠٣)

(٢) سورەتی (البقرە) ئایەتی (٢٥٦)

(٣) سورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٣)

## دامەزراوەکانی سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا
## یان دەسەڵاتەکانی سیستەم لە ئیسلامدا:

سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا لە دوو دامەزراوەی سەرەکی پێک دێت:

**یەکەم:** دامەزراوەی (أهل الحل و العقد) ئەمانە پێك هاتوون لە زانا و سەرکردە و پیاو ماقوڵانی وڵات.

**دووەم:** دامەزراوەی دەسەڵاتە شەرعیەکان ئەمانیش لەوانە پێك دێت:

١- دەسەڵاتی یاسادانان: ئەم دەسەڵاتە دەسەڵاتی سەرۆك، یان خەلیفە بە شورا و هاوکاری دەبێت.

٢- دەسەڵاتی دادوەری: ئەمە دەسەڵاتی قەزایە.

٣- دەسەڵاتی جێبەجێکردن: ئەمەیان ئەنجومەنی وەزیران دەگرێتەوە.

جگە لەم سێ دەسەڵاتە دەسەڵاتێکی تر هەیە پێی دەڵێن دەسەڵاتی چاودێری و هەڵسەنگاندن: ئەمەش کاری چاودێری کردنی کارەکانی حاکم و خەلیفەی موسڵمانانە[1].

---

(١) (النظام السياسي في الاسلام، د. رمضان عمر)

## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا

### سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا چەند تایبەتمەندییەکی هەیە لەوانە:

١- خوداییە .

٢- گشتگیرە .

٣- جیهانیە .

٤- (واقیعیة) .

٥- مام ناوەندە (الوسطیة) .

### دەرئـەنجـــام

١- سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا سیستەمێکی گشتگیرە، سەرجەم جومگەکانی ژیان دەگرێتەوە.

٢- سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا لەسەر بنچینەی (شوری)، دادگەری، یەکسانی، ئازادی دادەمەزرێت.

٣- سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا تاکە سیستەمە دوورە لە ستەم و زۆرداری.

٤- بەرژەوەندی گشت تاکێك دەپارێزێت بەبێ جیاوازی. جیاکردنەوەی ئیسلام لە سیستەمی سیاسی جیاکردنەوەو لادانی چەندین ئایەت و قورئان و ژیانامەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم).

ئەمە پێناسەیەکی کورت و پوختی سیستەمی سیاسی بوو لە ئیسلام تەنها بۆ بەرچاو ڕوونی.

## سیستەمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا

ڕاستییەکی جێگیرە وەك (ئیبن خەلدون) دەڵێت: مرۆڤ بەسروشتی (مەدەنیە) ناتوانێ بە تەنها بژی، مرۆڤ لە کۆمەڵگایەك لە دایك دەبێت، لەکۆمەڵگایەك دەژی هەر لە وێش دەمرێت. مادەم کۆمەڵگە بوونی زۆر پێویستە بۆ مرۆڤەکان، بوونی سیستەمیش بەهەمان شێوە پێویستە، چونکە مرۆڤ بە ئازادی ڕەها و بێ سنور بژی، سیستەمی نەبێ وەك سیستەمی دارستانی لێ دێت. کەواتە هەردەبێ سیستەمێك هەبێ سنورێك بۆ مرۆڤەکان دابنێ لە ئەمانەت و ئاشتی و ئاسایش دا بژیت. کەواتە هەموو کۆمەڵگەیەك پێویستی بە سیستەمێك هەیە دەبێت ئەم سیستەمە لەسەر بنەما و بنچینە و یاسای ڕێکوپێك دامەزرابێت. هەروەها پێویستە ئەم سیستەمە چاك و پاك بێت بەرژەوەندی مرۆڤەکان بەگشتی بەرجەستە بکات، خراپەکان دوورخاتەوە. بێگومان ئیسلام جوانترین ئایینە لەسەر بنەما و بنچینەیەکی ڕێك دامەزراوە، چاکە و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤی تێدایە.

### بنەماکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام

بنەماکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلام بیروباوەڕە، هەموو تاکێکی کۆمەڵگە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی مادام موسڵمانە دەبێت هەڵگری ئەم بیروباوەڕە بێت، بۆ ئەوەی بزانین ناوەندی خۆی لەم ژیانەدا لە کوێیە؟ بۆچی دروستکراوە؟ ئامانجی چییە؟ ئەم بیروباوەڕە والە مرۆڤ دەکات هەڵسوکەوت و سلوکی لەناو کۆمەڵگە دیار بێت. بیروباوەڕ بنچینە و بناغەی کۆمەڵگەیە، تاوەکو تاك بزانێ لەنێو کۆمەڵگەدا ماف و تایبەتدمەندی چین، (ئینتمای) بۆ کۆمەڵگە هەبێت و هاوکاری بکات، بەسەری بخات، پێشی بخات. بەڕاستی کاتێك سیستەمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا ئەم بنەمایەی پێشکەشکرد بە مرۆڤایەتی بنەمای دامەزراندنی کۆمەڵگە لەسەر بیروباوەڕە، مێژووی مرۆڤایەتی ئەوەی نەزانیبوو، ڕۆمان، فارس، یۆنان، عەرەب، پێش ئیسلام بینای

کۆمەڵگایان لەسەر بنچینەی ڕەگەز یان هۆز، یان نەتەوەیی دادەمەزراند. ئەمەش زوڵم و ستەم و زۆرداری و بێ ڕێزی بەرامبەر بە بەهاکانی مرۆڤایەتی لێ دەکەوێتەوە، ئیسلام ئەم بنچینەی دانا لەسەر بنچینەی تەواوی مرۆڤەکان یەك جۆرن:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾[(١)]

واتە: (ئەی خەڵکینە لە خەشم و نارەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن، کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروست کردووە).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت:

(کلکم من آدم وآدام من تراب)

واتە: (ئێوە هەموتان لە ئادەمن، ئادەمیش لە خۆڵە ). زەویش موڵکی هەموانە نابێ مرۆڤی لێی بێبەش بکرێت:

﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ﴾[(٢)]

واتە: (زەویشی بۆ خەڵکی ڕاخستووەو باری هێناوە). دامەزراندنی کۆمەڵگە لەسەر بنەمای بیروباوەڕ بەبێ زۆر لێکردن:

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾[(٣)]

(واقیع) شاهێدە خەڵکی ناموسڵمان لە وڵاتی موسڵمانان ژیاوە بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی.

---

(١) سورەتی (النساء) ئایەتی (١)

(٢) سورەتی (الرحمن) ئایەتی (١٠)

(٣) سورەتی (البقرە) ئایەتی (٢٥٦)

## ئەنجامەکانی کۆمەڵگەی دامەزراو لەسەر بیروباوەڕ

**١- برایەتییەکی بێ وێنە:** بەهۆی بیروباوەڕەوە کۆمەڵگەیەکی تەبای برایەتییەکی بێ وێنە دروست دەبێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴾[١]

واتە: (بەراستی تەنها موسولمانان برای یەکترن ).

(الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ)[٢].

واتە موسڵمان برای موسڵمانە. وەنەبێ بەهۆی ئەم بیروباوەڕە ستەم لە ناموسڵمانانەکان بکرێت، ئەوان بەوپەڕی ئازادی ژیان بەسەر دەبەن لە ژێر یاسای دادگەری:

﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ ﴾[٣]

واتە: (ڕق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت کەلە دادپەروەریی لابدەن، دادپەروەربن، ئەوە نزیکترە لە تەقواو خواناسیەوە، دەی کەواتە لەخوا ترس و پارێزکاربن، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو کارو کردەوەیەی کە دەیکەن.).

**٢- کۆمەڵگەیەکی بێ دەمارگیری:** دەمارگیری ڕیزی کۆمەڵگە تێکدەدات، ژیان ئاڵۆز دەکات، هەندێکیان بەسەر هەندێکیان زاڵ دەکات، بۆیە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلام ئەم دروشمە بەرز دەکرێتەوە و پەیڕەوی دەکات:

(لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ)[٤]

---

(١) سورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٠)

(٢) ئیمام احمد و موسلیم گیراویانەتەوە .

(٣) سورەتی (المائدة) ئایەتی (٨)

(٤) ئیمامی ابوداود گیراویەتیەوە .

واتە: (ئەو كەسە لەئیمە نیە بانگەشە بۆ دەمار گیری بكات، ئەوە لەئیمە نیە كە شەڕ لەسەر دەمارگیری بكات، لەئێمە نیە ئەو كەسە بمرێ لەسەر دەمارگیری ). هەروەها بانگەشەی وازهێنان دەكات لەم دەمارگیریە (دعوها فانها منتنة)، واتە: (واز بینە ئەمە بۆگەنی كەرە ).

**٣-** خۆپاریزی پێوەرە لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵگە: (مەنسوبیەت و مەعسوبیەت) بونەتە دوو پێوەری كومەڵگەی عەلمانی، ئەم دوو پلەیە كۆمەڵگەیان داگیركردووە، (كورسی و مەنصەب) و خیروبێری وڵات بەسەر ئەم دوو پلەیەدا بەش دەكرێت، بەشەكانی تری كۆمەڵگە بێ بەش و ماف خوراون. سیستەمی كۆمەڵایەتی لە ئیسلام بە یاسای:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ ﴾[1]

ئەم گرفتەی چارەسەركردووە. (مەنسوبیەت و مەعسوبیەتی) كۆتایی پێ هێناوە.



---

(١) سورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٣)

## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەئیسلامدا

بێگومان سیستەمی کۆمەڵایەتی پێویستترین سیستەمە بۆ مرۆڤ، بۆیە ئیسلام گرنگی زۆری پێ داوە، چەند تایبەتمەندییەکی هەیە بەکورتی دەیانخەینە ڕوو.

**یەکەم:** ڕەچاوکردنی ئەخلاق، لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەخلاق بەهایەکی بەرزی هەیە بۆیە بەرز ڕاگرتنی کۆمەڵگەیە، بۆیە بەم بەها ئەخلاقیە زینا و دزی ناپاکی و ڕەشوەو درۆ جوێندان و بوختان وسیخوڕی و غەیبەت و دووڕوویی و فێڵ و کارە نابەجێیەکان حەرامکراون، سنوری بۆ دانراوە، سزایان لەسەرە تا کۆمەڵگە بە پاك و ئەخلاق بەرزی بمێنێتەوە، لە بەرامبەردا ڕاستی و دادگەری و چاکی و پاکی دڵسۆزی و یارمەتیدان بە بەهای ئەخلاقین، کۆمەڵگە بەرەو بەرزی دەبات:

﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ﴾[١]

واتە: (یارمەتی و کۆمەکیی یەکتر بکەن لەسەر چاکەو خواناسی، نەکەن یارمەتی وکۆمەکی یەکتر بکەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی).

**دووەم:** دەستگرتن بە واتای دادگەری، هیچ بەشێکی ژیانی مرۆڤ نییە پێویستی بە دادگەری نەبێت، بەتایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆیە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی ئیسلام یاسای:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾[٢]

واتە: (بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر

---

(١) سورەتی (المائدة) ئایەتی (٢)

(٢) سورەتی (النحل) ئایەتی (٩٠)

ماڵ و نەفس و ناموس) و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

**سێیەم:** گرنگیدان بە خێزان (الاسرة)، تیۆرەکانی تر زۆر هەوڵیان داوە کۆمەڵگە لێك هەڵبوەشێننەوە، بە هەڵوەشانەوەی خێزان بەردی بناغەی کۆمەڵگا تێك دەچێت، ئەگەر خێزان چاك و پاك و سەرکەوتوو بوو کۆمەڵگە بەهەمان شێوە دەبێت.

## سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەم کیانەی ڕێکخستوە بەم شێوەیە:

**١- هاوسەرگیری:** بۆ مانەوەی کۆمەڵگە و گەشەکردنی هاوسەرگیری تاکە ڕێگایە بە چەندین یاسا ئەم بابەتە ڕێکخراوە، (٧٢) ئایەت لە قورئان و چەندین فەرمودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی ڕێڕەوی هاوسەرگیرییان کردووە.

(يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ) (١)

واتە: (ئەی گەنجینە ئەوانەی توانای ژن هێنانتان هەیە ژن بێنن ).

**٢- ڕێڕەوەکانی هاوسەگیری:** بۆ ڕێزگرتن لەم قۆناغە جوانە سیستەمی کۆمەڵایەتی چەند ڕێڕەوەیکی داناوە لە ژیان، یاسای:

(تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ : لِمَالِهَا ، وَلِحَسَبِهَا ، وَلِجَمَالِهَا ، وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ) (٢)

واتە: (ئافرەت بۆ چوار مەبەست دیاری دەکرێت، بۆ ماڵەکەی، نەسەبەکەی، جوانیەکەی، ئایینەکەی، دەست بگرە بەئایینەکە ئەگەر نا دەستت بەقوڕدادەچێ).

**٣- مافی ژن:** کۆمەڵێك ماف و تایبەتمەندی بۆ ژن داناوە، لەسەر پیاو (واجب) کراوە لە مارەیی و نەفەقە و ڕێزگرتن لە ژیانی یاسای:

﴿ وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ﴾ (٣)

---

(١) ئیمام بوخاری و موسلیم گیراویانەتەوە .

(٢) ئیمام بوخاری و موسلیم گیراویانەتەوە .

(٣) سورەتی (البقرە) ئایەتی (٢٢٨)

واتە: (ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان). و هەروەها، ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾[1]

واتە: (هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر).

**٤- مافی پیاو:** لە بەرامبەر مافی ژنان بۆ هاوسەنگی ژیان و دابەشکردنی ئەرك وماف بە یەکسانی، بەپێی پسپۆڕی پیاویش چەند مافێکی هەیە لە ژێر یاسای:

﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾[2]

واتە: (پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بەهۆی ڕێزو زیادە ئەرکێکەوە، کە خوا داویەتی بەهەندێك بەسەر هەندێکی تردا (سەرەڕای ئەوەی کە)پیاوان لەماڵ و سامانیان خەرج دەکەن).

**٥- فرە ژنی:** بۆ حاڵەتی نائاسایی وەك چارەسەرێك بۆکۆمەڵگە پیاو بۆی هەیە چوار ژن بهێنی لە ژێر یاسای:

﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً﴾[3]

واتە: ( لە ئافرەتانی تر کە حەڵاڵن بۆتان ژن مارە بکەن دوو دوو، یان سیان سیان، یان چوار چوار، خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نەتوانن دادپەروەر بن (لەنێوان هاوسەرەکانتاندا ) ئەوە با یەك ژن مارە بکەن).

**٦- تەڵاق:** ئەوەش وەك کۆتا ڕێگا بۆ چارەسەری گرفتەکانی کۆمەڵگە، ئەگەر کۆتا ڕێگا نەگەیشتنە یەك لە ژیان ئەم ڕێگایە هەڵبژێرن و لەگەڵ ئەوەی لە (شەریعەت)دا برەو پێدراو نیە:

---

(١) سورەتی (النساء) ئایەتی (١٩)

(٢) سورەتی (النساء) ئایەتی (٣٤)

(٣) سورەتی (النساء) ئایەتی (٣)

(أبغض الحلال إلى الله عز وجل الطلاق )[1]

واتە: (ئەو حەڵاڵەی لەلای خودا ناپەسندە تەلاقدانە).

**چوارەم:** دیاریکردنی پێگەی ئافرەت لە کۆمەڵگە، لە سیستەمی کۆمەڵگەی ئیسلامی پێگەی ئافرەت دیاریکراوە، زۆر بەرز ڕاگیراوە و چەندین مافی بۆ دیاری کردووە:

١- ڕێزیان لێ بگری: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾[2]
واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە).

٢- بە چاکە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾[3]
واتە: ( ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان ).

٣- مارەیی: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾[4]
واتە: (مارەیی ئافرەتان بدەن بەوپەڕی دڵفراوانی و ئاسوودەییەوە) .

٤- مافی دایەنی بۆ منداڵەکانی .

٥- مافی خوێندن .

٦- مافی سیاسی .

بێگومان چەند ئاداب و ڕەوشتێکی تایبەتیش هەیە بە ئافرەت ئەمە لە کتێبەکانی (فقهی) ئافرەتان و باری کەسیەتی درێژەی پێدراوە.

---

(١) سنن ابی داود .

(٢) سورەتی (الإسراء) ئایەتی (٧٠)

(٣) سورەتی (البقرە) ئایەتی (٢٢٨)

(٤) سورەتی (النساء) ئایەتی (٤)

**پێنجەم:** هەموو تاکێك چاکسازی کۆمەڵگەی لەسەرە، هەموو تاکێك لە کۆمەڵگە بەرپرسیارەتی پاراستنی کۆمەڵگەی لەسەرە، بەرپرسە لە چاکسازی و خزمەتکردن، نابێت گەندەڵ بێ و گەندەڵی بڵاوبکاتەوە لە ژێر یاسای:

﴿ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَـٰحِهَا ﴾[1]

واتە: (خەڵکینە) فەساد و گوناە و تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا دوای ئەوەی چاکەکاریی ڕەنگی گرتووە). تاکەکانی کۆمەڵگە هاوکاری و پشتگیری یەکترن لە چاکسازی:



﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾[2]

واتە: (ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیرو هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفەتیانە): فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن).

ئەوەیە بەکورتی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە ئیسلامدا، پرسیار دەکەین ئایا کۆمەڵگەیەك بەم شێوازە دابمەزرێ شوێنی گەندەڵچی و فاسیدەکانی لێ دەبێتەوە؟ بێگومان؟ نەخێر، ئەم سیستەمە لەگەڵ ژیانی مرۆڤەکان تەواو تێکەڵ نییە، دەکرێ بڵێین! ئەم ئایینە و ئەم سیستەمە لە ژیان جیابکرێتەوە؟ بێگومان نەخێر.

---

(١) سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٥٦)

(٢) سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٧١)

# سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

سیستەمی ئابووری لە حوكمڕانیدا كەمتر نییە لە هەردوو سیستەمی سیاسی و كۆمەڵایەتی، ئێمەش دەمانەوێ بیردۆزی عەلمانیەكان، (جیاكردنەوەی ئایین لە ژین) هەڵوەشێنینەوە، بۆیە پوختەیەك لە سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا باس دەكەی.

## دەروازە

جیهان بە گرفتێكی ئابووری خنكێنەر تێدەپەڕێ، ڕۆژبەڕۆژ سیستەمە ئابووریەكان نیشانەی هەرەس هێنانیان لەبازاڕی (واقیعی) ئابووریە جیهانیەكان دەبینرێت، سیستەمی ئابووری لە ئیسلام چارەسەری تەواوی پێیە، بۆ ئەم قەیرانە ئابووریە، كە بەرۆكی جیهانی گرتووە، سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا یاسا و ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، وەرنەگیراوە لە سیستەمی سەرمایەداری و سۆسیالیستی، بەڵكو یاسایەكی ئاسمانیە هاتووە بۆ ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو، كاتێك سیستەمی ئابووری سۆسیالیستی هەرەسێ هێنا، بەشێك پێیان وابوو سەرمایەدار و لیبرالیەت سەركەوتنی بەدەست هێنا، هەرەس هێنانی سەرمایەداری هۆكاری ناوەكی و دەرەكی هەبوو، بەهەمان شێوە سەرمایەداریش.

شارستانیەتی ڕۆژئاوا چوار سیستەمی ئابووری پێشكەش بە مرۆڤایەتی كرد، لە سێ سەدەی ڕابردوودا، سەرمایەداری، سۆسیالستی، فاشیەت[١]، لەكۆتاییدا خۆشگوزەرانی، هەریەك لەوانە بیناكرابوو لەسەر تێڕوانینی ڕۆژئاوا

---

(١) فاشیەت: ڕێبازێكی سیاسی ئابووریە لە (ئیتالیا) سەری هەڵدا و لەسەر بناغەی سەندیكاكان دامەزراوە و دەوڵەت خۆی هەڵدەقورتێنێی لەسەرجەم جموجۆڵە ئابووریەكاندا.

بۆ گەردوون، ژیان، مرۆڤ. ئەوەی لێ بەرهەم هات، ئەوە بوو ئایین و بەهاکان هیچ پەیوەندییەکی بە مرۆڤەوە نییە، لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، بەڵکو هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان وەك هەڵسوکەوتی گیاندارەکان وایە بە دوای تێرکردنی خۆیاندا دەگەڕێن، هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەڕێی ئابووریەوە پاڵنەرەکەی تەنها بازاڕە دوور لە ڕەهەندی (ئەخلاقی)، سەرمایەداری بینای تیۆری خۆی لەسەر ئازادی ئابووری دانا، بەبێ هیچ کۆت و بەندێك، پشتی بە بازار و قازانج بەست، سۆشیالیستی بینای تیۆری خۆی لەسەر پرۆژەی گشتی و پاڵنەر و هاندەرە کۆمەڵایەتییەکانی دانا، فاشییەکان بینای ئابووریەکانیان لەسەر تێکهەڵکێش کردنی سەرمایەداری و سۆشیالیستی دانا. دەرئەنجام سەرمایەداری دەوڵەتی لێ پەیدا بوو، پشت بەست بوو بە سیاسەت و بواری سەربازی، بەڵام دەوڵەتی خۆشگوزەران بینای ئابووری لەسەر سیستەمێکی ئابووری تێکەڵاو دانا بەجۆرێك شێوەی سەرمایەداری تێکەڵ بەبەزەیی کۆمەڵایەتی کرابوو. ئەم چوار سیستەمە ئابووریانە، لەم سێ سەدەیە پێشکەش کرا لەلایەن ڕۆژئاواوە ڕۆژبەڕۆژ بێکاری، هەژاری، نەخۆشی لە زیاد بوون دابوو، کۆمەڵێك لە سەرمایەداریدا دەژین، بەشێکی نانی ڕۆژانەی نییە، ئێستا لە سۆماڵ و بەشێکی زۆر لە وڵاتان لەسەدەی بیست و یەکەم، لە چەرخی جیهانگەرایی و مافی مرۆڤ و ئازادی مرۆڤەکان لە برسان دەمرن! ڕاپۆرتی بانکی دەوڵەتی دەڵێت: ڕێژەی هەژاری لەساڵی (٢٠١٠) گەیشتۆتە (٦٤) ملیۆن کەس. هەروەها ڕاپۆرتی کاری نێودەوڵەتی دەڵێت ڕێژەی بێکاری گەیشتۆتە (٢١٠) ملیۆن کەس لە جیهان[1].



---

(١) (البنك الدولي الافاق الاقتصادية العالمية ٢٠١٠)، مكتب العمل الدولي ٢٠١٠

## بنچینە و بناغەی سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا چەند بنەما و بنچینەیەکی هەیە لەگەڵ هەر چوار جۆری سیستەمی ئابووری جیاوازە، بەکورتی و پوختی ئاماژەیان پێ دەکەین.

**یەکەم:** ماڵ ماڵی خودایە مرۆڤەکان جێنیشینن لەسەر ئەم ماڵە، موڵکایەتی تەنها بۆ خودایە خودای گەورە مرۆڤەکانی کردۆتە جێنشین لەسەری:

﴿وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[١]

واتە: (لەو ماڵ و سامانەی کە خستویەتیە ژێر دەستان و جێنشینن تیایدا، ببەخشن).

**دووەم:** دیاریکردن و دەست نیشان کردنی پێداویستیەکانی مرۆڤ بەپێی پێویستی، زانایان پێداویستیەکانی مرۆڤیان بۆ سێ بازنە دابەش کردووە و پێشنەیان داناوە لە دوای یەکتر بەم شێوەیە دابەشیان کردووە:

١- (زەروریات) ٢- (الحاجیات) خواست ٣- (تەحسینیات)

زەرورەتیان بە مافی گشتی داناوە بۆ هەموو تاکێك پەیدای بکات بە هەوڵوکۆشش و ماندوو بوونی خۆی ئەگەر نەیتوانی پەیدای بکات لەبەرهەر هۆکارێك، ئەوە لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە پێویستە بۆی دابین بکەن، ئەگەرنا دەوڵەمەند و دراوسێیەکانی:

(ما آمن بي من بات شبعان وجاره جائع إلى جنبه، وهو يعلم به)[٢]

واتە: (ئەمە چ ئیماندارێکە چ ئیمانێکی بەمن هێناوە زکی تێرەو دراوسێکەسی لە تەکیەوە برسیە، لەکاتێکدا ئاگادارە). لەم بازنەیە دەبێ (زەروریاتی) مرۆڤەکان پڕبکرێتەوە تا برسیەکان تێردەکرێت، بێ پۆشاك پۆشاك دەکرێ، نەخۆشەکان چارەسەردەکرێن.

---

(١) سورەتی الحدید ئایەتی (٧)

(٢) بەزار گێڕاویەتیەوە

**سێیەم:** مافی موڵکداری، یان خاوەنداری، هەموو تاکێك وەك مافێکی بنچینەیی مرۆڤەکان مافی موڵکداری هەبێت، ئیسلام بەم مافە هانی تاکەکان دەدات تا هەوڵوکۆشش بدەن، بەڵام ئەم مافە ڕێکخراوە بۆ ئەوەی ستەم لەکەس نەکات و قۆرخکاری لە موڵکداری نەکات.

﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ﴾(١)

واتە: (بۆ ئەوەی ئەو سامانە تەنها لە نێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت). لەگەڵ ئەوەش مافی هەژار و نەدارەکانی لە ڕێگەی زەکات و خێر دیاری کردووە لەم موڵکایەتیە.

**چوارەم:** بەرپرسیاریەتی هاوبەش، لە سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا بنەمایەکی بەهێز هەیە بۆ نزیکبونەوەی کۆمەڵگە لەیەکتر و هاوشانی و هاوخەمی یەکتر، بۆیە چەند ڕێگەیەکی داناوە لەوانە: (زەکات، خێر، وەسیەت، وەقف، کەفارەت). قورئان ئاماژەی بەوە کردووە، کە مافی هەژاران لە ماڵی دەوڵەمەندانە:

﴿وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ﴾(٢)

واتە: (هەروەها ئەوانەی کە بەشێکی دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە، بۆ هەژاری داواکارو بێ نەوای داوانەکەر). ئیمامی عەلی (خوا لێی رازی بێ) دەفەرمووێت: (خودای گەورە لەسەر دەوڵەمەندانی واجب کردووە لە ماڵەکانی بەپێی پێویست بداتە هەژاران، ئەگەر برسی بوون، یان بێ پۆشاك بوون، ئەگەر دەوڵەمەندان مافی هەژارانیان نەدا خودای گەورە لە ڕۆژی دوایی سزایان دەدات).

---

(١) سوڕەتی (الحشر) ئایەتی (٧)

(٢) سوڕەتی المعارج ئایەتی (٢٤ - ٢٥)

**پێنجەم:** مافی کارکردن، کارکردنی مرۆڤەکان هەنگاوێکی سەرەکییە بۆ وەدەست هێنانی بەرهەم لە کۆمەڵگەدا، ئیسلام هانی تاکەکان دەدات کار بکەن باشترینیان ئەوەیە کە مرۆڤـ بەدەستەکانی خۆی پەیدای بکات. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: باشترین کار، (بيع مبرور وعمل الرجل بيده)[1]، واتە: (کڕین و فرۆشتنی بەرەکەتدارو کارکردنی دەستی خۆت). باشترین یاسایە هەموو تاکێك مافی کارکردنی هەیە.



**شەشەم:** دابەشکردنی دادگەرانەی داهاتی دەوڵەت، دابەشکردنی داهاتی دەوڵەت بە دادگەری لە گرنگترین بنچینەکانی سیستەمی ئابوورییە لە ئیسلامدا، ئێستا میللەتان لەژێر چەتری سیستەمی ئابووری دەستکرد بەدەست ستەم و نادادگەری دەناڵێنن، جارێکیتر ڕژێمی چینایەتی سەری هەڵداوەتەوە، گەندەڵی لە دابەشکردن کۆمەڵگای شێواندووە سەرمایەدارەکان کام شوێن و داهاتی باش بۆ خۆیان و کەس و کاریان قۆرخ دەکەن، بۆیە دادگەری بنچینەیە بۆ ئاشتی و دادگەری کۆمەڵایەتی[2].

---

(١) ئیمامی بەزار گێڕاویەتیەوە .

(٢) (النظام الاقتصادي في الاسلام )، د.عمر بن فيهان، د. عبدالله السعيدي

## سەرچاوەکانی سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

### سیستەمی ئابووری لەئیسلامدا پشت بەم سەرچاوانە دەبەستێت:

١- قورئان .

٢- سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .

٣- کۆ دەنگی زانایان .

٤- کەلەپوری ئیسلامی .

### سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا پەیوەستە بەم بنەمایانە:

لەکاتی جێبەجێکردندا سیستەمی ئابووری بە چەند بنەمایەکەوە پەیوەست کراوە، نابێ لێی لابدات، ئەم بنەمایانە لە هیچ سیستەمێکی ئابووری دەستکردی دونیادا نییە لەوانە :

١- پەیوەست بوون بە بەها ئیمانیەکان، لە ئیسلامدا هەموو کردەوەیەك پەیوەندی بە لایەنی ئیمانەوە هەیە، لەسەر هەموو کردەوەیەکیش پاداشت و سزا هەیە، سیاسی بێ، یان ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان هتد...، پێویستە تاك لەکاتی جێبەجێکردنی ئابووری ڕەچاوی چاودێری و لێپرسینەوە بکات لەبەر دەستی خودا.

٢- پەیوەست بوون بە بەها ئەخلاقیەکان، ئەمەش لەکاتی مومارەسە دەبێت تاك پەیوەست بێت بە سپاردە، ڕاستگۆیی، هاوکاری، برایەتی .

٣- پەیوەست بوون بە حەڵاڵ، کارکردن و کڕین و فرۆشتن و بازرگانی تەنها لە حەڵاڵ دەکرێت دەبێ تاك دوور بێ لە ریبا، قۆرخکاری، فێڵ، ڕەشوە .

٤- پەیوەست بوون بە کارکردن، بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی خۆش لە ڕۆزی پاك و حەڵاڵ، زیادکردنی بەرهەم هێنان.

٥- پەیوەست بوون بە دووركەوتنەوە لە خواردنی ماڵی حەرام، سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا یاسای بن بڕكردنی گەندەڵی دانەوە.

(كل المسلم على المسلم حرام، دمه، وعرضه، وماله)[١]

واتە: (هەموو موسڵمانێك خوێن و ماڵ و ناموسیان لەیەكتر قەدەغەیە).

٦- پەیوەست بوون بە مەرجەكانی كڕین و فرۆشتن و بازرگانی لە ئیسلامدا، چەند ڕێسایەك هەیە لە كڕین و فرۆشتن و بازرگانیدا دەبێ تاك پێوە پەیوەست بێت.



٧- چاودێری و موڵكایەتی تاك، نابێ هیچ تاكێك ماڵی تاكێكی تر بخوات بەناهەق تەنها بە ڕازامەندی نەبێت.

## پاڵنەرەكانی جێبەجێكردنی سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

### چەند هاندەر و پاڵنەرێک هەیە بۆ جێبەجێكردنیان لەوانە:

١- هاندەر و پاڵنەری ئیمانی وەك: هەست كردن بە بەرپرسیارەتی لێپرسینەوە لەلای خودا.

٢- پاڵنەر و هاندەری كۆمەڵایەتی، وەك: فەرمان بە چاكە و قەدەغە كردنی خراپە

٣- پاڵنەرو هاندەری دەسەڵات، وەك: دامودەزگاكانی حكومەت لەسەر جێبەجێكردنی بواری ئابووری[٢].

---

(١) موسلیم گێڕاویەتیەوە

(٢) (اساسيات النظام الاقتصادي الاسلامي في مجال التطبيق)، د.حسين حسين شحاته (ل ٧)

## تایبەت مەندیەکانی سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

١- سیستەمی ئابووری بەشێکە لە ئیسلام.

٢- هاوسەنگی لەنێوان ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵ، تایبەتی و گشتی.

٣- هاوسەنگی لەنێوان هەردوو لایەنی ماددی و روحی.

٤- ڕەچاوکردنی پێوەری (ئەخلاقی) .

٥- گرتنەخۆی دامەزراویی و گەشەسەندن .

٦- جگە لەمانە (واقیعی) و مرۆیی و گشتگیرە .

## ئامانج لە سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا

### سیستەمی ئابوری لە ئیسلامدا چەند ئامانجێکی سەرەکی هەیە لەوانە:

١- وەدەستهێنانی پێویستی تەواوی ژیان. واتە ژیانێکی ئاسودەیی، پڕ بەپێویستی مرۆڤەکان فەراهەم بکات .

٢- وەبەرهێنان: پاکترین و چاکترین بەرهەم وەبەر بهێنێ، دوور لە بەرهەمی شتە زیانبەخشەکان .

٣- ڕێکخستن و نزیککردنەوەی نێوان وەبەرهێنان و بەکاربەر .

٤- وەدەست هێنانی داهاتی ئابووری بۆ پاراستنی ئومەتی ئیسلامی .

٥- وەدەست هێنانی دادگەری بۆ دابەشکردنی وەبەرهێنان و بەکاربەر .

ئەمە پوختەیەك بوو لە سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا[1]، بۆ ئەوەی عەلمانیەکان بزانن ئیسلام ژیانە و لە ژین جیاناکرێتەوە .

ئیسلام ئەم سیستەمە جیهانیە گشگیرەیە بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان هاتووە، تا مرۆڤ پەیوەندی خۆی لەگەڵ خودا، لەگەڵ خۆی، لەگەڵ براکەی، لەگەڵ مرۆڤەکان و کۆمەڵگە، لەگەڵ گەردوون و ژیان ڕێك بخات. بۆیە سیستەمی کۆمەڵایەتی، سیاسی، پەروەردە و فێرکردن، ژینگە، هەموو بەشەکانی تری ژیانی تێدایە، خودای گەورە ئەم یاسایەی بۆ مرۆڤەکان ناردووە، داوای کردووە بەدوای بکەوین).

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[2]

واتە: (لەوەودوا ئێمە تۆمان ئەی محمد خستۆتە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوان لە هەموو کارو بارێکی ئەم ئاینەدا، کەواتە شوێنی بکەوە و لێی لامەدە، نەکەی شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوان بکەویت کە نازانن و نافامن).



---

(١) تێبینی: سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا یەکجار فراوانە چەند بەرگی دەوێ تا لە سەری بنوسرێ، بەڵام ئەمە تەنها بۆ ڕەتدانەوەی عەلمانیەکانە، تا نەڵێن بۆ ژیان بە کەڵك نایەت، بۆ گەنجان و موسڵمانی کەم زانیارین لە ئیسلام، تا سەرسام نەبن بە سیستەمی عەلمانی .

(٢) سورەتی (الجاثية) ئایەتی (١٨)

# کۆتایی

دانانی مەنهەجێکی دروست، دیاریکردنی ڕێڕەوی ژیانی گۆمەڵگا، دروستکردنی تاك، لەم سەردەمە ئالوزەدا کارێکی ئەستەمە. بەتایبەتی بو ١٠٠ سال دەچێت رۆژهەڵاتی ناوەراست، جیهانی ئیسلامی بەتەواوی کەوتۆتە بەر شاڵاوی وڵاتە زلهێزەکان و هەرچی پێان کرابێ لەبواری فکری و ئابوری و سەربازی و .. هتد، دا بەم ناوچەیە کراوە، بێگومان ١٠٠ ساڵ کەم نیە، بۆیە لەئیستادا لەبەر گاریگەری ئەم هەموو مەدرسە فکریە لەسەر تاکەکانی گومەڵگا متمانە کردن بەیەکتر لاواز بوە، گرفتەکان ئەوەندە زۆرن نازانی پەنجە بۆ کامیان درێژ بکەی، لەکێوە دەست پێبکەی، ئوممەی ئیسلامی وەك لاشەیەکی نەخۆشی لێ هاتووە، چەندان نەخۆشی جیاوازی لێ کۆبۆتەوە، هەندێکیان لەهەندێکیان قولترن، دیاری کردنی چارەسەر بۆ هەریەکێك لەم نەخۆشیان ئەستەمە، وێنە کردنی ئوممەی ئیسلامی بەلاشەکی نەخۆش لەوانەیە خوێنەر وا لی بکات بێ ئومێد بێت، بەڵام ئەمە راستیە ناکرێ نکوڵی لێ بکەین، بو سەلماندنی ئەم راستیەش کە ئوممەی ئیسلامی چەندان گرفتی لێ کۆ بوتەوە، بەکورتی ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین لەوانە : لێك ترازان، چەند بەرەکی، نەبونی متمانە بەیەکتر، ڕای زۆر جیاواز لەنێوان یەکتر ناتوانی کۆیان بکەیتەوە، یەکتر قبوڵ نەکردن، هەرکەس خۆی دەبێ سەرۆك بێت، یەکتر تەکفیرکردن، نەبونی هاوکاری لەنێوان یەکتر، نەبونی یەك سەرکردەو مەرجەع، هەموو کەس خۆی بەڕاست دەزانێ و ئەوانی تر بەهەڵە، تەقلیدکردن، دواکەوتەیی، دواکەوتوویی لەبوارەکانی زانست و تەکنەلۆژیایی سەردەم، زاڵ بونی بەرامبەر بەسەر هەرچی هەمانە، برەودان بەفکری هاوردە، زۆرینەکەی هەڵگری فکری عەلمانیە، هوشیاری سیاسی لاوازە، سەرسامە بە ئەوروپا، دان بەوە دانانی کەلەدواوەیە، ئەمانەو

چەندان گرفتی تر هەر یەك لەوانی تر چارەسەری ئەستەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئێمە ئومەتی هەستانەوەین، بڕوامان بەهێزە، خودامان لەگەڵە، قورئانمان دەستورە، خاکمان بەپیتە، جوگرافیامان ستراتیجیە، کۆمەڵگامان گەنجە، مێژومان گەنجینەیە، هەستانەوە ئەستەم نیە، تێگەیشتن لەواقیع مەحال نیە، چارەسەری ئەم گرفتانەش لەتوانای مرۆڤەکان بەدەر نیە، سەیری ئەورپا بکە سالانێکی دورو درێژ لەنێو زەلکاوی نەخوێندەواری و زوڵم و ستەم و دوا کەوتەیی دەژیان، بەچرکە ساتێك نەگەیشتنە ئەم داهێنان و پیشکەوتنە، مەنهەج و ڕێڕەوو بیرمەند سێ بنەمای سەرەکی بون بۆ هەستانەوە . پێویستە ئاوڕ لەمیژوو بدەینەوە فێری ژیانت دەکات، قوتابخانەیە بۆ بیرمەندان، سەرچاویە بۆ تێگەیشتن، میژوو نمونەی سەیر و سەر سوڕهێنەری تێدایە چۆن ئەم گەلە، ئەم دواکەوتوییە، ئەم ژێر دەستەییە ڕزگاری بوەو هەستاوەتەوە، شۆڕشی کردوە، بۆتەوە پێشەنگ، ئەگەر ئیرادە هەبێ، بیرمەند هەنگاو بنێ، بیری تاکەکان تەندروست بێ، هەستانەوە ئاسانە، ئەم واقیعە تاڵەی ئێستا نەوەی نوێ تییدا دەژی، ئاڵۆزە، تێکەڵە، ئاسان نیە، عاقل تێیدا سەر سامە، دروستکردنی تاکی بیرمەند لەنەوەی نوێیدا گرنگترین هەنگاوی سەرکەوتن و هەستانەوەیە، هیچ نەوەیەك نەیتوانیوە هەستێتەوە تاچەندان ڕۆڵی لە نەوەی نوێیدا پێ نەگەیاندبێ، ئیسلام ئەم ئایینە بەهێزەیە، بەردەوام سەدان گەنجی لەنەوەی نوێ گەیاندوتە لوتکە، نەوەی نوێ ئەم دەست بژێرەیە تەوژمی فکری عەلمانی زۆر بەچڕی کاری لەسەر دەکەن، شەپۆلی فکری هاوردە لەجیهانی ئیسلامی بۆتە زەنگێکی مەترسیدار بۆ سەر نەوەی نوێ، ئەگەر ئەم توێژەیان لەخشتە برد گۆمەڵگا لێك هەڵدەوەشێ، دەبێتە ژێر دەستەی فکری عەلمانی، لەئەنجامی تێکەڵ بونمان لەگەڵ نەوەی نوێ، بۆمان دەرکەوت گەنجان توشی قەیرانێکی فکری بونەتەوە، پیویستیان بەدەستکری فکری هەیە، دەستی بگرێ، ڕێی بۆ دیاری بکات، مەنهەجی بۆ دانێ، بنەمای سەرەکی بۆ دەست نیشان بکات، فکری هاوردەی بۆ بناسێنێ، تیۆرە سەردەمیەکانی بۆ شی بکاتەوە، پەنجە لەسەر برینەکان دا بنێ، پەردە لەسەر فکری ڕاستەقینەی عەلمانی لابدات، واقیعی بۆ شیبکاتەوە، سیناریۆیەکانی بۆ تەفسیر کات، فکری ئیسلامی وەك هەڵێنچراوی

قورئان و سونەتی تەواوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەبێ شێوادن پێشان بدات، ئەگەر نا چارەنوسی نەوەی نوێی بەرەو تاریکی هەنگاو دەنێت، ڕێی لێ بزر دەبێت، بەکاردەهێندرێت، دیارە ئەم کتێبەی بەر دەستت لەگەڵ ئەوەی قەبارەکەی بچوکە بەڵام ڕێرەوە، فکرە، بنەمایە بۆ نەوەی نوێ، بەرچاورونیە، ئاماژەیە، ئاشناییە بۆ تێگەیشتن لەواقیع، هەنگاوە، بڕیارە، بۆ دروستبونی تاك، بەرەو چارەسەرێکی گونجاوە بۆ ئەم قۆناغە، بەتایبەتی لەڕوی فکری و تیۆرییدا، خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبە بەرهەمی شەونخونی چەندان مانگە زۆر جار تا نوێژی بەیانی نەخەوتوم و بەدیاریەوە دانیشتوم، بەئومێدی ئەوەی بۆ ئێوە سود بەخش بێ، خودا لەمنیش وەرگرێ، ئەوەی ڕاستم گوتبێ ئەوە لەخوداو لەپێغەمبەری خوداوەیە، ئەوەی هەڵەم کردبێ ئەوە لەشەیتان و نەفسی خۆمەوەیە، ئەگەر هەڵەیەکتان بینی ڕاستیەکی لەشوێنی دابنێین و دوعایەکی خێرم بۆ بکەن.



﴿وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾

يونس: ١٠

تەواو بووم بەپشتیوانی خودا

**ئیدریس کاریتانی**

لە ٢٨ شعبان ١٤٣٥ کۆچی

٢٠١٥/٦/١٦ هەولێر

# سەرچاوەکان:

دوای قورئانی پیرۆز:

١- احوال فقه الواقع ومهارات التحليل السياسي، مقالة، له پێگەی ئەلیکترۆنی (العمق).
٢- احياء علوم الدين ، ابو حامد الغزالي.
٣- الاديان والمذاهب المعاصرة د.ناصر العقل و د. ناصر القفاري.
٤- ازمة العقل المسلم ، عبدالحميد احمد ابو سليمان.
٥- الازمة الفكرية المعاصرة، د. طه جابر العلواني.
٦- اساسيات النظام الاقتصادي الاسلامي في مجال التطبيق , د.حسين حسين شحاتة.
٧- اسرار حركة الضباط الاحرار ، حموده، حسين محمد احمد.
٨- اصول الدعوة، د. عبدالكريم زيدان.
٩- اصول العلم ومنهجية الاقراء والدرس, شيخ هشام البدراني.
١٠- اصول علم النفس العام في ضوء الاسلام ، احمد محمد عامر.
١١- الاعجاز العددي في القران الكريم - نوفل عبد الرزاق.
١٢- الافعى اليهودية في معاقل الاسلام. عبدالله التل.
١٣- افكار الماركس في الميزان، طارق حجي.
١٤- امة إقرأ لا تقرأ، حسن آل حمادة ، مقالة.
١٥- البناء الفكري، د. فتحي حسن ملكاوي.
١٦- بين المفكر والمتختص.د. عبدالكريم بكار (مقالة).
١٧- تجديد الفكر الاسلامی، دكتۆر محسن عبدالحميد.
١٨- التحرير والتنوير، ابن عاشور.
١٩- التربية الاسلامية والقرن الخامس عشرالهجري .

٢٠- تطور المجتمع عبر التأريخ، سيفال.
٢١- تعدد الاحزاب السياسية في الدولة الاسلامية المعاصرة، شيخ هشام البدرانى.
٢٢- التعريفات للجرجانى.
٢٣- تعليم التفكر- فتحي جروان.
٢٤- التفكير ونظرية المعرفة د.احمد باليساني.
٢٥- تكوين المفكر د. عبدالكريم بكار.
٢٦- تكوين المفكر د. عبدالله حميدالدين.
٢٧- الحركة الاسلامية، رؤية مستقبلية, محمد غزالي.
٢٨- خصائص المفكر الناقد، خالد بن مصطفي.
٢٩- دراسات فى الفكر الاسلامى ، محمد حسين عبدالله.
٣٠- دور حرية الراي فى الوحدة الفكرية بين المسلمين ، عبدالمجيد المختار.
٣١- الدين والسياسة، ردوود والشبهات، يوسف القرضاوى.
٣٢- الدين، محمد عبدالله دراز.
٣٣- رسائل في الاديان ، محمد بن ابراهيم الحمد.
٣٤- السنن الالهية في الامم والجماعات والافراد. د. عبدالكريم زيدان.
٣٥- السنن الالية وأثرها في فهم الواقع ، أبو مريم محمد الجريتلي.
٣٦- سنن الترمذي.
٣٧- سوننى دارة مي.
٣٨- الشخصية الاسلاميه للنبهاني ، بتحقيق هشام بدرا ني.
٣٩- صحيحى بوخارى.
٤٠- صحيحى موسلم.
٤١- گەنجان لەنیوان گرفتی سەردەم و چارەسەردا، ادريس كاريتانى.
٤٢- العلمانيه نشأنها و تطورها، د. سفر الحوالى.
٤٣- فەرهەنگ دەريا، ڕزگار كەريم.
٤٤- فتح الباري شەرحي صحيح البخاري.
٤٥- الفكر الاسلامى فى مواجهة الغز و الثقافى، مصطفى حلمي.
٤٦- الفكر الاسلامي ، محمد محمد اسماعيل .

٤٧- الفكر الاسلامي المعاصر، دراسة في التدافع الحضاري د. محمد خروبات.
٤٨- الفكر طبيعته واهميته، أ.د. عبدالكريم بكار.
٤٩- الفلسفة العربية مازالت في الطور السلبي ، لقاء مع يوسف سلامة.
٥٠- الفوائد . ابن القيم الجوزية.
٥١- في النظام السياسي للدولة الاسلامية، محمد سليم العوا.
٥٢- قوة التفكير، د.ابراهيم الفقي.
٥٣- كتاب الامة، عبدالمجيد النجار.
٥٤- الكتاب المقدس العهد الجديد انجيل متى العبارة (٢١).
٥٥- كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم للتهاوني.
٥٦- الكليات للكوفي، ضاثي دووەم مؤسسة الرسالة.
٥٧- كواشف زيوف في المذاهب الفكريه المعاصر. عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني.
٥٨- لسان العرب.
٥٩- مالك بن نبي وموقفه من القضايا الفكرية المعاصرة ، سالة ماجستير، حسن موسى محمد العقبي.
٦٠- مجمل اللغة لابن فارس.
٦١- محاضرات من مناهج وطرق تدريس، فيصل عبدالقادر عبدالوهاب .
٦٢- المذاهب الفكرية المعاصرة و دورها في المجتمات وموقف المسلم منها، د. غالب بن علي عواجي.
٦٣- مذاهب فكرية معاصرة ، محمد قتب.
٦٤- المستدرك علي الصحيحين.
٦٥- مسند احمد بن حنبل.
٦٦- مطارق السنن الالهية ، سلمان فهد العودة، مقالة.
٦٧- مفتاح دار السعادة. ابن القيم الجوزية.
٦٨- مفردات الفاظ القران، راغب الاصفهانى.
٦٩- مفردات الفاظ القران. راغب الأصفهاني.
٧٠- مفهوم الفكر واهميته، جميل عبدالله المصرى.
٧١- مقاييس اللغة لابن فارس.

٧٢- منهج الفن الاسلامي ، محمد قطب.
٧٣- موسندى بەزار.
٧٤- موسوعة الرد على المذاهب الفكرية المعاصرة - على بن نايف الشحود.
٧٥- الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، الندوة العالمية للشباب الإسلامي.
٧٦- موسوعة بيان الإسلام الرد على الإفتراءات والشبهات: دەستەيەك لەزانا گەورەكانى جيهان .
٧٧- النظام الاقتصادي الاسلام , د.عمر بن فيهان, د. عبدالله السعيدي.
٧٨- النظام السياسي في الاسلام، د. رمضان عمر.
٧٩- الوعي السياسي د. فتحي يكن.
٨٠- اليوم الغد، سلامة موسى.
٨١- EnsyBratannicavol.Hp19.

ئەم وا قیعە تاڵەی ئێستا نەوەی نوێی تێدا دەژی، ئاڵۆزە، تێکەڵە، ئاسان نیە، عاقڵ تێیدا سەر سامە، دروستکردنی تاکی بیرمەند لەنەوەی نوێدا گرنگترین هەنگاوی سەرکەوتن و هەستانەوەیە، هیچ نەتەوەیەك نەیتوانیوە هەستێتەوە تاچەندان ڕۆڵی لەنەوەی نوێدا پێ نەگەیاندبێ، ئیسلام ئەم ئایینە بەهێزەیە، بەردەوام سەدان گەنجی نەوەی نوێ گەیاندۆتە لوتکە، نەوەی نوێ ئەم دەست بژێرەیە تەوژمی فکری عەلمانی زوۆر بەچڕی کاری لەسەر دەکەن، شەپۆلی فکری

بۆ سەر نەوەی نوێ ، ئەگەر ئەم توێژەیان لەخشتە برد کۆمەڵگایەک هەڵدەوەشێ ، دەبێتە ژێر دەستەی فکری عەلمانی، لەئەنجامی تێکەڵ بونمان لەگەڵ نەوەی نوێ، بۆمان دەرکەوت گەنجان توشی قەیرانێکی فکری بونەتەوە، پێویستیان بەدەستگری فکری هەیە، دەستی بگرێ، ڕێی بۆ دیاری بکات، مەنهەجی بۆ دابنێ، بنەمای سەرەکی بۆ دەست نیشان بکات، فکری هاوردەی بۆ بناسێنێ ، تیۆرە سەردەمیەکانی بۆ شی بکاتەوە، پەنجە لەسەر برینەکان دابنێ ،

سیناریۆیەکانی بۆ تەفسیر کات، فکری ئیسلامی وەك هەڵێنجراوی قوئان و سونەتی تەواوی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ شێواندن پێشان بدات، ئەگەرنا چارەنوسی نەوەی نوێ بەرەو تاریکی هەنگاو دەنێت، ڕێی لێ بزر دەبێت، بەکار دەهێندرێت، دیارە ئەم کتێبەی بەردەستت لەگەڵ ئەوەی قەبارەکەی بچوکە بەڵام ڕێرەو ، فکرە، بنەمایە بۆ نەوەی نوێ، بەر چاوڕونیە، ئاماژەیە، ئاشنابیە بۆ تێگەیشتن لەواقیع، هەنگاوە، بڕیارە، بۆدروست بونی تاك، بەرەو چارەسەرێکی گونجاوە بۆ ئەم قۆناغە،

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
نرخی 7000 دینار